# ڕێبەر

ژمارە ١٣

پایزی ٢٠٢٢

گۆڤارێکی وەرزی پێشمەرگانەی هەمەڕەنگە

مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە دەریدەکات

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

19 75

PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN






**وەستا ڕەسوڵ**

لێپرسراوی مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە

ئامانجی ئێمە ئەوەیە لەڕووی فکری و مەبدەئییەوە هێزی پێشمەرگە بە باشترین شێوە پەروەردە بکەین.




گۆڤارێکی وەرزی پێشمەرگانەی هەمەڕەنگە
مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە دەریدەکات

**Email: govaryrebar@gmail.com**

خاوەنی ئیمتیاز:مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە

سەرنووسەر: بەرزان حاجی ئیبراهیم چەرمەگا
٠٧٧٠١٥٣٣٥٣٢

بەڕێوبەری نووسین: ئیسماعیل خالید
٠٧٧١٩٦٨٥٩٣٨

سەرپەرشتیاری کۆمپیوتەر: گۆران عەبدوڵڵا

دیزاین و کاری هونەری: سەرمەند سەلیم

کۆمپیوتەر:
شنە محەمەد نەجات
هیوا ئەحمەد مەحمود
شەماڵ ئەشرەف
ئیدریس جەبار

# پێرست

# چاکسازی پێویستە

سەرنووسەر

پێداچوونەوە بە کاری حزب و ڕێکخستنەوەی سیاسەتەکانی، گرنگییەکی زۆری هەیە لەم قۆناغەدا. پێویستە چەند ساڵ جارێک پێداچوونەوە بکرێت. بە مەرجێک پێداچوونەوەکە لەسەر ئەساسی چاکسازی بێت و دووربێت لە دەستەگەریی. تا کاری حزبی گروتینێکی نوێ وەربگرێت.

هەروەها لەناو هێزی پێشمەرگەدا پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوە پێویستە و دەبێت ئەو کەسانە دەستنیشان بکرێن کە دەتوانن خزمەتی کورد و ئەو حزبە بکەن کە لەناویدا خەبات دەکەن. بە هەمان شێوە دەبێت ڕەچاوی کەسی دڵسۆز بکرێت. هەرچەندە بەداخەوە زۆر جار لەسەر حیسابی وەلای شەخسی ئەو کەسانە دادەنرێن کە خزمەت بە حزبەکە ناکەن و بگرە زیان بە پێگە و ناوبانگی حزبەکەش دەگەیەنن.

لەئێستادا زۆر پێویستە سەرۆک بافڵ بە چاوێکی دووربینانە ئەم پرۆسەیە ئەنجام بدات و سەرلەنوێ هەیکەلی حزبی دابڕێژێتەوە. بەو هیوایەی ئەم پرۆسەی چاکسازییە هەموو جومگەکانی حزب بگرێتەوە. تا بە ویژدانەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسە ماندووەکاندا بکرێت و کەسی شیاو دابنرێن. نەک لەسەر حیسابی مەزاجی شەخسی.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەر لەدروستبوونییەوە، واهاتووە کە ساڵ بە ساڵ خۆی نوێکردۆتەوە. لەئێستاشدا دەبێت هەوڵمان بۆ ئەوەبێت یەکێتی بکەینەوە بەو یەکێتییەی هیچ نەیارێک لەبەردەمیدا خۆی نەگرێت. لەڕێی چاکسازیشەوە دەکرێت ئەم هەنگاوە هەڵبنێین.

# دیداری ڕێبەر



ئامادەکردنی: ئیسماعیل خالید

لەدیداری ئەم جارەی گۆڤاری ڕێبەردا چاومان کەوت بەبەڕێز کاک وەستا ڕەسوڵ ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەرپرسی مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە بە مەبەستی زیاتر بەئاگابوونی فەرماندەو کادران و هێزی پێشمەرگەی کوردستان. لە چاکسازی و گۆڕانکاریەکانی وە ڕێکخستنەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و مەڵبەندەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

**پ- بەڕێز کاک وەستا ڕەسوڵ مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە لەکوێی ئەو گۆڕانکاریانەدایە کە لەنێو هێزی پێشمەرگەدا دەستی پێ کردووە؟**

و- زۆر سوپاس بۆ ئێوە و بۆ ڕێبەرەکەتان بێ گومان مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە و کۆی هێزەکانی (٧٠) پاکێجێکن بۆ ڕێکخستنەوە. مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە دەبێت لەگەڵ دوو لایەندا کار بکات.

لایەنێک لەگەڵ فەرماندەی گشتی کە ئێستا لیوایەکی تازە درووست دەبێت کە ئەو لیوایە بەشێکە لە مەڵبەند و دەبێت ڕێکخستنەکانی ناو هێزی پێشمەرگە ڕێک بخاتەوە لایەنەکەی کە مەکتەبی ڕێکخستنە کە کۆی

مەڵبەندەکانی کوردستان ڕێک دەخاتەوە مەڵبەندی پێشمەرگەش بەدەر نیە لەم ڕێکخستنەوەیە بۆیە ئێمە چاوەڕێی بەرنامەکەی مەکتەبی ڕێکخستن دەکەین وەلایەنە ئەساسیەکەی مەڵبەندی پێشمەرگە کاری مەیدانیە کاری ناو لیوا و کۆمیتە و کەرتەکانە بۆیە لەگەڵ تەشکیلەی هەر لیوایەکدا ئێمە خۆ ڕێکخستنەوەمان بەردەوامە و کارمان لەسەر کردووە و بەباشیش کارەکانمان ڕۆشتووە ئەوەی کە دەمێنێتەوە کادرەکانی ناو مەڵبەندە وەک و جێگر و کارگێڕ و ئەندام مەڵبەندەکانە ئەو کاتەش بەپێی ئەو سیستەمەی کە بۆ هەموو مەڵبەندەکانی تری کوردستان دادەنرێت مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگەش بەو سیستەمە ڕێکدەخرێت.

## پ- ئەو گۆڕانکاریانەی کە دەکرێن چین؟ لەکوێدا خۆی دەبینێتەوە؟

و- گۆڕانکاریەکان بەم شێوەیەن: بۆهەر مەڵبەندێک سێ جێگر و دە کارگێڕی دەبێت وە ئەندامی بەشیشی دەبێت وە ئەم دە کارگێڕە دەبنە لێپرسراوی بەش لەناو مەڵبەنددا و مەڵبەندەکەی ئێمە ڕەنگە تایبەتمەندی هەبێت بۆیە بە ڕەچاوکردنی ئەو تایبەتمەندیە داوای جێگر و کارگێڕی زیاترمان کردووە چوونکە ئێمە جگە لەبارەگای سەرەکی مەڵبەند سێ بارەگای تریشمان هەیە.

بارەگایەک لە ڕانیە و یەکمان لەهەولێرە و یەکمان لە قەرەهەنجیرە. بۆئەم بارەگایانەش کارگێردائەنێین. لەئێستادا لەبری کارگێڕ جێگر لێپرسراوی بەشەکانە بۆیە ئێمە بەرنامەمان هەیە کارگێڕەکان کاری خۆیان بکەن و جێگریش بەهەموو مانایەک جێگربێ هەرکات من لێرەنەبووم ئەو ئەرکەکان بگرێتە ئەستۆ. خاڵی دووهەم تایبەت مەندیەکانی مەڵبەندی پێشمەرگە ئەوەیە ئێمە سێ جۆر ڕێکخستنمان هەیە

١-تایبەتمەندی هێزەکانی حەفتا

٢-ئەوهێزانەی لە وەزارەتی پێشمەرگە کاردەکەن

٣-هێزەکانی بەرگری و فریاکەوتن

جگە لەوەی چوارکۆمیتەشمان لەسەر بەغداد هەیە بۆیە جێگرەکانی ئێمە دەبێ کاری ڕێکخراوی وکاری حزبی بکەن وەئەمەش لەمەودوا دەکەینەبەرنامەی ئەساسی خۆمان

## پ- چۆن مامەڵە لەگەڵ ژمارەی جێگرو کارگێرو ئەندام مەڵبەندەکان دەکرێت؟

و- بەنسبەت کادرە زیادەکان لەجێگرو کارگێڕئەنجومەنێک لەنێو ئەم مەڵبەندە دروست دەکرێت بەناوی ئەنجومەنی پشتیوانی یان ڕاوێژکاری.

ئەم ئەنجومەنە بەرپرسێکیان دەبێ و مانگانە یەک جار کۆبونەوە ئەنجام دەدەن وەئیشی ئەساسی مەڵبەند وەرناگرن. پێم وانیە ئێمە ئەنجومەنی مەڵبەند



کادرمان زۆر لێ زیادبێ بەنسبەت کارگێڕو ئەندام مەڵبەندەکانەوە ڕەنگە کەمیشمان هەبێ وپێویستمان بەکارگێڕو ئەندام مەڵبەندی تریش هەبێت.

**پ- بەڕێزتان لەو ماوەیەدا کە ئەرکی لێپرسراوێتی مەڵبەندتان لە ئەستۆ گرتووە جموجۆڵێکی هۆشیاری و ڕوناکبیری بەکارەکانتانەوە دەبینرێت ئایە بەردەوام دەبن یان لەچوارچێوەی چەند خولێکدایە؟**

و- ئێمە بەپێی توانا بەرنامەی وەرزی دائەڕێژین بۆ نمونە ئەم بەرنامەیە هەتا مانگی نۆ بوو. ئەم بەرنامەیەمان کە دەستمان پێکردووە بۆ هەر ئەفسەرێک پێکهاتبوو لە نۆ محازەرە. لەدوای ئەمە بەرنامەیەکی کە دائەڕێژین بەپێی وەرزەکان بەرنامەکانمان وەرزیە بۆ خولەکانی داهاتوو تەرکیز دەخەینە سەر چەند مادەیەکی کە. وە بەردەوامیش دەبین و پێمان وایە مەڵبەندی پێشمەرگە مەڵبەندی لایەنە فکریەکەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە وەکو چۆن پێشمەرگە پێویستی بە مەشق و ڕاهێنانە ئاوهاش پێویستی بە پەروەردەی وشیاری هەیە خوا لێخۆشبوو هەڤاڵ مام جەلال ئەیفەرموو پێشمەرگە بەبێ مەشق گۆجە و بەبێ زانیاری کوێرە بۆیە ئامانجی ئێمە ئەوەیە لەڕووی فکر و مەبدەئەوە هێزی پێشمەرگە بە باشترین شێوە پەروەردە بکەین.

**پ- زۆر جار کە لێپرسراوێک دەچێتە شوێنێک سەرەتا بە گوڕوتینەوە دەچێت بەڵام پاش ماوەیەک بە هەر هۆکارێک بێت بەو شێوەیە بەردەوام نابێت، ئایا بەڕێزتان هەر بەردەوام**

دەبن؟

و- من هەموو کارەکانی پێشووترم شایەتی ئەوەن کە هەرگیز لە گوڕوتین ناوەستم و بەردەوام دەبم مەگەر ڕام بگرن إن شاءلله ڕام ناگرن

## پ- بەرنامەت بۆ مەڵبەندی پێشمەرگە چیە لە ئایندەدا؟

و- سەرەتا بارەگای مەڵبەند بۆ مەڵبەندێکی وا گەورە لەبار و گونجاو نیە. چونکە ئەم بارەگایەی ئێستا مەڵبەندی تێدایە پێشتر مقەڕی سریە بووە جێگەی مەڵبەندی تێدا نابێتەوە مەڵبەند پێویستی بە شوێنێکی گونجاو و لەبارترە. ئێستا کاری لەپێشینەمان ئەوەیە بینایەکی گونجاومان دەستنیشان کردووە لەگەڵ ئیدارەی گشتیدا لە گفتوگۆداین بۆ نۆژەن کردنەوەی بیناکە مەرحەلەی یەکەم بیناکەیە چونکە بینا هەیبەتە بۆ مەڵبەند. نازانم چۆن ئەوە قبوڵ کراوە کە مەڵبەندێکی وا گەورە بێتە جێگەی سریەیەک!

مەرحەلەی دووهەم پرۆژە و چاکسازیەکانی مەکتەبی ڕێکخستنە کە ئێمە هاوکاریان دەبین.

مەرحەلەی سێهەم دابینکردنی هۆڵێکی گەورەیە بۆ کردنەوەی خولی بەردەوام بۆ ئەفسەرەکانی ناو هێزی پێشمەرگە گەشە بەلایەنە فکریەکەی فەرماندە و سەربازەکانی هێزی پێشمەرگە بدەین وە لەئایندەشدا بەرنامەمان هەیە کە ڕادیۆیەکی تایبەت بە مەڵبەندی پێشمەرگەمان هەبێت تا بتوانین هێزی پێشمەرگە لە هەر جێیەک بێت پەیامی مەڵبەندی پێشمەرگەی پێ بگات تا بتوانین بە گۆڤار و بە ڕادیۆکە گەشە بەلایەنە فکریەکانی هێزەکانمان بدەین.

## پ- دوا وتەت بۆ گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە چیە؟

و- بەردەوام گەشە بەگۆڤارەکەتان بدەن و لایەنی فکری و مەبدەئی هێزی پێشمەرگە زیاتر گەشە پێ بدەن وە پێم باشە بەشداری بە مامۆستا ئاینیەکان بکەن مامۆستا ئاینیە کوردەواریەکانی خۆمان بابەیامی ئاینە پیرۆزەکەی ئیسلام وەکو خۆی بگات بە هێزی پێشمەرگە تاکو هێزەکانمان توشی چەواشە کاری نەبێت وە دینی پیرۆزی ئیسلام وەکو خۆی پەیرەو بکەن چونکە دینی ئیسلام لە خزمەتی مرۆڤایەتیدایە کە ئێستا چەند تاقمێک و باندێک پەیدا بوون دەڵێن مرۆڤ بکوژە با دین گەشە بکات دینی ئیسلام هەرگیز ڕێگەی بە کوشتنی خەڵکی بێ تاوان نەداوە بۆیە پێویستە مەلا ڕۆشن فکرەکان بەشداربن لە گۆڤارەکەتان دا.



پرۆفیسۆر/دکتۆر حەزا تۆفیق تالیب
پسپۆڕی جیۆستراتیج و ئاسایشی نەتەوەیی

# ســـــــتراتــیژ

## لەنێوان هەردوو چەمکی سەربازی و سیاسیدا

بەشی دووەم:

ستراتیژ بەمانا بەر فراوانەکەی:

لەسەرەتاوە وشەی ستراتیژ وەک زاراوەیەکی سەربازی بەدەر کەوت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا، بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی چەمکەکەدا وەک چەمک و زاراوەیەکی بەرفراوانتر لەبواری سەربازی لێک دەدرایەوە و بووە (پەیوەستدار بە بەدیهێنانی ئامانجەکان)٢٨. بەم پێیەش ستراتیژی سەربازی بووە لقێک لە لقەکانی ستراتیژی گشتگیر یان نەتەوەیی. پاش ئەوەی بواری ستراتیژ بەرفراوانکراو سەرجەم بوارەکانی سیاسی و ئابوری و سەربازی وکۆمەڵایەتی گرتە خۆ و بواری ستراتیژ بووە جێگە بایەخی سەرکردایەتی باڵای دەوڵەت و پێناسەکەی چووە چوارچێوەی قاڵبێکی نوێوە کەدەڵێت (ستراتیژ بریتیە لە زانست و هونەری بەکارهێنانی توانا سیاسی و ئابوری

و سەربازی و دەرونییەکانی دەوڵەت یان کۆمەڵێک دەوڵەت بەمەبەستی بەدیهێنانی زۆرترین پشک لەپشتگیری سیاسی لەهەردوو کاتی جەنگ و ئاشتیدا)٢٩. واتە بەکارهێنانی سەرجەم هێزی دەوڵەت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییە باڵاکانی دەوڵەت. لێرەدا جیاوازی لەنێوان سیاسەت و ستراتیژدا بەدەر دەکەوێت. بەوەی سیاسەت ئامانجەکان دەستنیشان دەکات. بەڵام ستراتیژ بایەخ بەڕێگاکان و خستنە گەڕی تاکتیک بۆداهاتەکانی بەردەست و بەکارهێنانیان بە باشترین شێوە بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکان٣٠. هەروەها دەکرێت بڵێین ستراتیژ بریتیە لەزانست و هونەری پەرەپێدان و تاکتیک و بەکارهێنانی توناکانی دەوڵەتێک یان چەن دەوڵەتێک لەکاتی ئاشتی و جەنگدا. بەمەبەستی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە نەتەوەییانەی کەسیاسەت دەست نیشانی دەکات٣١.

دەکریت ئێمەش بەدەرئەنجامێک دەرچین و بەم شێوەیە پێناسەی ستراتیژ بکەین بەوەی(بریتیە لەو زانستەی یان ئەو هونەرەی کەلەڕێگەیەوە سەرجەم تواناو دیاردە ئابوری و جوگرافی و مرۆیی و دیپلۆماسی و سەربازیەکان دەخاتە گەڕ لەپێناو گەیشتنە پێگەیەکی

ستراتیژی نەتەوەیی (باڵا) بریتیە لە تێڕوانینێکی ستراتیژی بۆ زامنکردنی ئاسایشی ناوخۆ و پاراستنی بەرژەوەندرییە ژیاریی و بنەڕەتیەکانی هەرنەتەوەیەک (کەلێک) بەسوود وەرگرتن لەمێژوو و ئەو دەستکەوتانەی کە لە هێزی جوگرافیاکەیەوە بەدەستیهێناوە لەگەڵ کاریگەرییە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانی بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە مانەوەی خۆی

بەهێز لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی و گەیشتنە ئامانج)، لێرەدا دەکرێت دەستنیشانی ستراتیژی هاوچەرخ بکەین لەچوار بنەمای سەرەکیدا کەبریتین لە٣٢:

١-ستراتیژ پەیوەستی ئاسایشی دەوڵەت وکۆمەڵگایە.

٢-ستراتیژ مانای کۆکردنەوەی دەرامەتی کۆمەڵگاو ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنیەتی

٣-چەمکی ستراتیژ بەگوێرەی گۆڕانکاریەکانی هەل و مەرج و دەرامەت و هەڵبژاردەکانی بەردەست گۆرانکاری بەسەردا دێت.

٤-ستراتیژ لە نێویدا چەند ستراتیژێکی تایبەتمەند دەگرێتەخۆ، کە پەیوەستی و تەواوکاریان لە نێواندا هەیە، بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی هەرستراتیژییەک لەبواری تایبەتمەندی خۆیدا تا ئەوستراتیژییە گشتیە بهێنرێتە دی کە سیاسەت دەستنیشانی کردووە.

ئەوچوارخاڵەی کە خستمانە ڕوو بەشێوەیەکی گشتی خۆی لە ستراتیژی گشتگیر یا نەتەوەییدا دەبینێتەوە کە بە ستراتیژی باڵاش دەناسرێت (Grand Strategy)، لەبەرئەوە پێویستە باس لە ستراتیژی نەتەوەیی بکەین.

ستراتیژی گشتگیریان نەتەوەیی:

ستراتیژی گشتگیر یان نەتەوەیی بریتیە لەوئامانجە نەتەوەییە باڵایانەی کە ئەرکی جێبەجێکردنیان دەکەوێتە سەر شانی سەرکردایەتی سیاسی، ئامانجە نەتەوەییەکانیش ئەوانەن کە دەوڵەت هەموو تواناکانی خۆی بۆدەخاتە گەڕ بەمەبەستی بەدیهێنان، و پشت بەچەند ڕەگەزێک دەبەستێت کە ئەمانەن٣٣:

١-پێویستە سەرکردایاتیەکی کردە و بەتوانا هەبێت کە پلانی ستراتیژی بەڕێوە ببات.

٢- داڕشتنی چەن پلان و پرەنسیپێک کە دەستنیشانی ئامانجە نەتەوەییە باڵاکانی دەوڵەت بەشێوەیەک بکات، بگونجێت لەگەڵ پرینسیپەکانی ئاسایشی نەتەوەییدا.

٣- ئەم پرێنسیپانە ڕەها نەبێت، بەڵکو بەگوێرەی هێزی بەردەست و توانا نەتەوەییەکان و قەبارەی مەترسییە دەرەکیەکان و ئاستەنگە نێوخۆییەکان و سروشتی سیستمی نێودەوڵەتیەوە دادەڕێژرێت.

خەسڵەتەکانی ستراتیژی گشتگێر یان نەتەوەیی:

ستراتیژی گشتگیر، کەهەندێک

لەپسپۆڕانیش بەستراتیژی باڵاش ناوی دەبەن چەند خەسڵەتێکی دوور مەودا و گشتی دەگرێتە خۆ لەوانەش٣٤:

١-گشتگیری: پێویستە ستراتیژی گشتگیر سیمای ئەوەی پێوە دیار بێت کەدیدێکی بەر فراوانی هەیە و وێنەی هەموو ژینگە سیاسیەکە دەبینێت و بەتەنها پەیوەست نابێت بەلایەنێک و لایەنەکانی دیکە پەراوێز بخات.

٢-دوور مەودا بێت: وا پێویست دەکات تەنها پەیوەست نەبیت بەگرنگیدان بەبابەتەکان بەتەنها. بەڵکو وا پێویست دەکات ڕەگەزی کاتیش بەهەند وەر بگیرێت.

٣-هەستیاری ڕێگاکان: مەبەست لەو ڕێگاو میکانیزم وکەرەستە سیاسی و دەرامەتانەی دەوڵەتە کەلەبواری پیادەکردنی ستراتیژی باڵا بەکار دەهێنریت و دەبێت بەشێوەیەکی گونجاو مامەڵیان لەگەڵدا بکرێت.

٤-ئامانجەکان: پێویستە جەخت لەو ئامانجانە بکرێتەوە کە ویستی بەدیهێنانیان هەیە لەمەودای دووردا. واتە گرنگیدان بە ئامانج و مەبەستەکان کەوەک خاڵی ستراتیژی بایەخدار چەسپێنراوە و واپێویست دەکات وەک ڕەگەزەکانی ستراتیژی باڵا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

٥-پەیوەستی لۆژیکی: مەبەست لێی جەختکردنەوەیە لەنێوان (ئامانج) و (ڕێگا یان هۆکار). کە دوو ڕەگەزی گرنگن لەپرۆسەی پیادە کردنی ستراتیژدا و نابێت دوو ڕگەزەکە تێکەڵ بەیەکتری ببن و جێگەی یەکتر بگرنەوە.

٦-کارلێککردن: پێویستە جەخت و بەئاگایی بگیرێتە بەر سەبارەت بەو هەوڵە دژ کاریانەی بەرامبەر ستراتیژی باڵا دەگیرێتە بەر. واتە پێویستە کارلێککردن لەگەڵ دژەکاری دوژمندا بکرێت. واتە پرۆسەی بەردەوامی ستراتیژی باڵا کاریگەری نێگەتیڤانەی دوژمنی لەسەر دوور بخرێتەوە.

جۆرەکانی ستراتیژ:

ستراتیژی نەتەوەیی (باڵا) بریتیە لە تێڕوانینێکی ستراتیژی بۆ زامنکردنی ئاسایشی ناوخۆ و پاراستنی بەرژەوەندییە ژیاریی و بنەڕەتیەکانی هەرنەتەوەیەک (گەلێک) بەسوود وەرگرتن لەمێژوو و ئەو دەستکەوتانەی کە لە هێزی جوگرافیاکەیەوە بەدەستیهێناوە لەگەڵ کاریگەرییە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانی بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە مانەوەی خۆی٣٥. دەکرێت جۆری ستراتیژیەکان بەم شێوەیە پۆلێن بکەین:

یەکەم//ستراتیژی سیاسی:

ئەم جۆرە لەستراتیژ خۆی لەو پرێنسیپ و پیلانانەدا دەبینێتەوە کە کەدەوڵەت دەیگرێتە بەر لەبواری پیادەکردنی لەنێو خۆی وولات و لەئاستی پەیوەندی نێودەوڵەتی و دەرەکیدا. پێش کلاوزەفیچ ڕای باو وا بوو کە سیاسەتی دووچاری یەککەوتن دێت. کاتێک پەیوەندی نێوان نەتەوەکان بە بەکارهێنانی چەک دەست پێدەکات. بەڵام ئەوە ڕوون بووەوە کە جەنگیش درێژکراوەی سیاسەتە و پەیوەندی دەوڵەتە بەشەڕهاتووەکانیش کۆتایی نایەن و ڕاناوەستن. گرتنە بەری ڕێگای شەڕ بەشێکە لە ستراتیژی گشتگیر و ئەو وڵاتانەی پیادەی دەکەن وەک بەشێک لە ستراتیژی باڵا لێی دەڕوانن. بەڵام ستراتیژی لە پێشینە دەدەنەوە ستراتیژی سیاسی٣٦.

سەبارەت بە سیاسەتی ناوخۆی وڵات. دەوڵەت بەرنامەی سیاسی تایبەت بەخۆی هەیە وهەڵقوڵاوی فەلسەفەی سیاسەتی. پرۆژەی بە دیهێنانی ئامانجە سیاسیەکان لەنێوخۆی وڵاتدا. کە خۆی دەبینێتەوە لە بەرقەرار کردنی ئاسایش و سەقامگیری و خۆشگوزەرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی تاکو هێنانە کایەی دۆخێک کە هاوڵاتی بگاتە ئاستێکی نمونەیی. ئەم پرۆسەیەش

ستراتیژی سەربازی بەو پێیەی بریتییە لە دابەشکردن و بەکارهێنانی توانا هۆکارە سەربازییە جۆراوجۆرەکان لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجی سیاسەتدا بە باشترین شێوە، کە تێیدا جۆرە گونجاندنێک لە نێوان تواناکان و ئامانجدا بسازێنرێت و کەمترین بەرگری و لەڕێگەی مانۆڕەوە و سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت



ئەرکـی سـتراتیژی سیاسـییە. لێـرەدا هاریـکاری نێـوان هـەردوو سـتراتیژی سـەربازی و سیاسـی دەبێتـە کارێکـی پێویسـت بـۆ سەرخسـتنی سـتراتیژی بـاڵای وولات٣٧.

دووەم ستراتیژی سەربازی:

سـتراتیژی سـەربازی بـەو قۆناغـەی کـە ململانێـی سـەربازی تێدا ئەنجام دەدرێـت و مـەودا و رووبـەری پەیوەسـتە بـە جەنگـەوە و بایەخـی ئـەم جـۆرە لەسـتراتیژ لـە بـواری چارەسـەرکردنی مەسـەلەکانی پەیوەسـت بەدابەشـکردن و بەکارهێنانـی توانـا سـەربازییەکانەوە بەدەردەکەوێـت. لەکاتـی بەدیهێنانـی ئامانجـی سـتراتیژییە باڵاکانـدا.

سـتراتیژی سـەربازی ئامـرازی (رێـگای) سـتراتیژی باڵایـە لەبـواری سـەرکەوتن لـە بەرەکانـی جەنگـدا و بەدیهێنانـی ئامانجـی سیاسـی. بەوپێیەیی بەشـێکە لـە ئامانجـی سیاسـی و بەگوێـرەی پـلان و پرۆگـرام بـۆ دارێـژراو و بـە شـێوەیەکی کردەیـی کاردەکات و سیاسـەتی هێـز ئاراسـتە دەکات.

سـتراتیژی سـەربازی بـەو پێیـەی بریتییـە لـە دابەشـکردن و بەکارهێنانـی توانـا هـۆکارە سـەربازییە جۆراوجـۆرەکان لەپێنـاو بەدیهێنانـی ئامانجـی سیاسـەتدا بـە باشـترین شـێوە. کـە تێیـدا جـۆرە گونجاندنێـک لـە نێـوان تواناکـان و ئامانجـدا بسـازێنرێت و کەمتریـن بەرگـری و لەرێگـەی مانـۆڕەوە و سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنرێـت لەبـەر

دەتوانین بڵێین ستراتیژی ئابووری ئەو چالاکی و ئاراستەیەیە کە پەرەپێدان و دابەش کردنی سەرجەم توانا ئابووریەکانی وڵات بەڕێوە دەبات، لەپێناو گەشە و خۆشگوزەرانی ئابووری نیشتمانی، وەک بەهێزکردنی هەردوو کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازی و پێشخستنی پیشەسازی سەربازی و زامنکردنی ئازوقەی سوپا و دابەشکردن و دۆزینەوەی هەلی کار بۆ بەهێزی کار.

**ئەوەی سیاسەتی سەربازی پیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە سیاسەتی گشتی وڵاتەوە و ئەو تایبەتمەندیانەی کە وڵات هەیەتی، بۆ نمونە ئەو وڵاتانەی کە پیادەی سیاسەتی سەربازی هێرشبەرانە دەکات، ئەوا سروشت پێکهاتەی هێزەکەی ئەوەی بە بەسەردا دەسەپێنێت، بەڵام ئەگەر سیاسەتی سەربازی بەرگریکەرانە بێت ئەوا هێزی سەربازی بە شێوازی بەرگریکەرانە پەیڕەو دەکات.**

**گرتنەبەری هەر سیاسەتێکی سەربازی لە هەر وڵاتێکدا پشت دەبەستێت بەبڕوای سەربازی (Military Doctrine)، کە بریتیە لە سەرجەم ئەو پرێنسیپ و سیاسەت و کارە هونەری و شێوازانەی کە لەڕێگایانەوە سوپا دەتوانێت ئاراستەی کارەکانی پێ بکات. ولە بیر و باوەڕ و شارەزایی پێشکەوتووی پراکتیکی و توێری بڕیار لەسەر دراوی هەڵێنجراوەوە وەردەگرێت[38] و کاریگەر دەبێت بەچەند هۆکارێک لەوانە[39]:**

**١-کاریگەری ستراتیژی نەتەوەیی کە لەڕێگەیەوە چوارچێوەی هێزەکانی سوپا و قەبارە و پەیوەندی نێوان چەندایەتی و جۆراوجۆر لە سوپادا دەستنیشان دەکرێت.**

**٢-ئەو ژینگە و ناوەندەی وڵات لە خۆ**



دەگرێــت لــە جــۆری پەیوەندیەکانــی لەگــەڵ دەوروبــەردا. لەبەرئــەوە بــڕوای ســەربازی گرنگــە لای ئــاگاداری دوژمنــی ڕاســتەقینە یــان دوژمنــی ئاینــدە بێــت وە لــە نیــاز و خواســت و بــڕوای ســەربازیان تێبــگات و ئاگاداربێــت.

٣- سروشــتی جوگرافــی وڵات وەک ســنوور و شــێوەو شــوێنی وڵات سەبارەت وشــکانی و دەریــا.

٤- دانیشــتوانی وڵات لــە ڕووی ژمــارە و دابەشــبوونی جوگرافــی و تێکــڕای زیــادەی دانیشــتوان.

٥- بنەمــا ڕوشــنبیری و کۆمەڵایەتــی و دەروونیــەکان.

سێیەم// ستراتیژی ئابووری:

بەدیهێنانــی ســتراتیژی ئابــووری مانــای کارکــردن لە پێنــاو بونیادنانــی ئابووریەکــی بەهێــز بــۆ وڵات و گرنگتریــن خاڵــی ســتراتیژی ئابــووری کارکردنــە لەپێنــاو ئابووریەکــی بەهێــزی ناوخــۆ. مەبەســتی دابینکــرن و زامــن کردنــی پێداویســتیە ســەرەکییەکانی دانیشــتوان و پاشــان توانــای بەدەســت هێنانــی ئاســتێکی بەهێــز لــە پایــەی ئابــووری تــا بتوانرێــت ڕکابــەری لەگــەڵ هێــز و جەمســەرە ئابووریەکانــدا بکرێــت.

لێــرەوە دەتوانیــن بڵێیــن ســتراتیژی ئابــووری ئــەو چالاکــی و ئاراســتەیەیە کە پەرەپێــدان و دابــەش کردنــی ســەرجەم توانــا ئابووریەکانــی وڵات بەڕێــوە دەبــات.

لەپێناو گەشە و خۆشگوزەرانی ئابووری نیشتمانی، وەک بەهێزکردنی هەردوو کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازی و پێشخستنی پیشەسازی سەربازی و زامنکردنی ئازوقەی سوپا و دابەشکردن و دۆزینەوەی هەلی کار بۆ بەهێزی کار، بەمەبەستی پارێزگاری کردن و زامنکردنی پێداویستیەکانی تاکی کۆمەڵ لە (خۆراک و خانوو و چارەسەر کردن) کەپێداویستی سەرەکی و زامنکردنی ئاستی هەرە نزمی گوزەرانی دانیشتوانە. ئەم هەنگاوانە و بەردەوامیان جۆرێک لە ئاسایشی ئابووری بۆ دانیشتوان دابین دەکات٤٠.

هەروەها زامنکردنی ئاستی پێویست لەخۆشگوزەرانی و پارێزگاری کردن لەپرۆژە ئابوریە نیشتیمانیەکان و خۆڕاگرتن لەبەردەم ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەنرخی کاڵا و مادە خاوەکاندا دێتە گۆڕێ، بەهۆی کێشەی جیۆسیاسی و گۆڕان لەتەرازوی هێزی سیستمە ئابووریەکان. ئەم هۆکارانە لەدەرەوەی ویستی وڵاتانن. بەڵام ستراتیژی ئابووری بەهێزی پێش وەخت توانای ئەوەی دەبێت لەئاسەوارەکانی ئەم گۆڕانکاریانە بەلایەنی کەمەوە تا ڕادەیەک کەم دەکاتەوە.

چوارەم/ ستراتیژی دەرونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری:

ئەو ستراتیژییەیە کەتیایدا دۆخی دەروونی دانیشتوان و سوپا لەبەرەکانی جەنگدا بەهەند وەردەگیرێت. ئەویش لەڕێگەی گەشەپێدانی دۆخی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دانیشتوان بەبەها و ئاکار و پرینسیپ نەریتی شارستانی و بەرزکردنەوە ئاستی مەدەنیەت و شارستانی دانیشتوان کە لەگەڵ ئایدۆلۆژیا و ستراتیژی نەتەوەییدا بگونجێت. سەبارەت بەستراتیژی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی جەخت لەسەر کاریگەری ڕۆشنبیری بکرێتەوە لەسەر ڕەفتاری تاک و لە دەرەنجامیشدا لەسەر کۆمەڵگا بەگشتی. لەبەر ئەوە ستراتیژی ڕۆشنبیری دەبێت لە سەرەتاوە کار لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری بکات و بونیادی ڕۆشنبیری دانیشتوان بەهێزتر بکات. ئەگەر ئەم لایەنەی نێو کۆمەڵگە پشتگوێ بخرێت. ئەوا کاریگەریە نێگەتیڤەکانی هەردوو هۆکاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دەبنە مەترسی لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ٤٠.

## سەرچاوەكان


٢٨-webster new colleagiate dictionary , (spring field massachusts), ١٩٨١, p ١١٤١.

٢٩- د. محمد السيد سليم، مفهوم التوازن الدولي و تطبيقاته الاقليمية، مجلة العلوم الاجتماعية، كلية الآداب، جامعة الكويت، ١٩٨٩،ص١٥٨.

٣٠- د.مصطفى كامل محمد، التوازن الاستراتيجي في شرق الأوسط و دورمصر، القاهرة، مركز الأهرام للترجمة و النشر، ١٩٩٥ ، ص٢١.

٣١- د.جمال مصطفى عبدالله السلطان، الأستراتيجية الأمريكية في شرق الأوسط، دار وائل للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٢، ص٢١-٢٢.

٣٢- د.عصام سليمان، مدخل إلى علم السياسة، دار النضال للطباعة، ط١، بيروت، ١٩٨٩، ص٩٢.

٣٣- د.عبدالقادر محمد فهمي، المدخل في دراسة الأستراتيجية، بغداد، ٢٠٠٩ ، ص٢٧-٣٠.

٣٤- د.عبدالله نصار المردحي، الاستراتيجيات المتناقضة، دارالبيان للنشر والتوزيع، ط١، بيروت، ص١٥٠.

٣٥- د.اسماعيل محمد السيد، الإدارة الأستراتيجية (المفاهم وحالات تطبيقة)، المكتب العربي الحديث، ط١، بيروت، ١٩٨٤، ص١٧٥.

٣٦- د.عبدالقادر محمد فهمي، مصدر سابق، ص١٩٤-١٩٥.

٣٧-ليدل هارت، الأستراتيجية و التأريخها في العالم، دار الكتاب العربي، ط٤، بيروت ،٢٠٠٠، ص٢٧٦.

٣٨- علاءالدين حسين خماس، العقيدة العسكرية وجوانبها (مبادىء وممارسات) شركة دار الأكاديميون للنشر والتوزيع، عمان، ط١ ،٢٠١٨، ص١٧٠-١٧١.

٣٩- د.عبدالله نصار المردحي، مصدر سابق، ص١٦٥.

٤٠-د.علي سيد اسماعيل، الأمن القومي العربي (و واقعة و آفاقه في ظل التحولات الأقتصادية العالمية المعاصرة)، دار التعليم الجامعي، ٢٠١٩، ص٦٩.

٤١- اسماعيل محمد سيد، مصدر سابق، ص١٩٦.



د. کامەران ئەحمەد

# ڕۆڵی هەتیو لە مێژوودا

## هەتیو وەک فەیلەسووف

ئیمامی غەزالی

ئەبو حامیدی طوسیی نیسابووری، بەیەکێک لە دیارترین و کاریگەرترین فەیلەسوفەکانی مێژوو و کۆمەڵگەی ئیسلامی دادەنرێت. ئەو لە خێزانێکی هەژاری (طوس) ی هەرێمی خۆراسان لە ساڵی (1058یان 1059) ز لەدایک بوو. باوکی پیاوێکی خواناسی سۆفی بوو، هەموو ئومێدێکی ئەوەبوو کوڕەکانی (محەمەد و ئەحمەد) بخاتە بەر خوێندن و داهاتوویەکی گەشیان هەبێت! بەڵام هەر زوو مردن یەخەی گرت و تەمەن بواری ئەوەی نەدا منداڵەکانی بخاتە بەر خوێندن و داهاتووە پرشنگدارەکەی (محەمەد)ی کوڕی ببینێت! واتە هەر زوو بەجێیهێشتن و ئەوانیش هەتیوو کەوتن! بەڵام ئایا مردنی باوک بووە هۆکارێک بۆ ئەوەی خەونە مەزنەکەی باوکی و خەونی گەورەبوونی خۆشی لەباربچێت؟

هەر لە منداڵییەوە کەسێتییەکی (بوێر) و (زیرەک) بووا هەر لە ناوچەکەی خۆیدا (فیقهی) خوێند و بۆ زیاتر فێربوون ڕووی کردە (جورجان) لەوێ بە مامۆستاکەی (ابی نصر الاسماعیلی) ئاشنابوو، وەک قۆناغی یەکەمی (وەرگرتن) هەر شتێکی لێدەبیست، تۆماری دەکرد. دواتر چووە نیسابووری پایەتەختی سەلجوقییەکان. لەو کاتەدا لە دوای بەغداوە بە پایەتەختی زانست دادەنرا! لەوێ بە ئیمامی حەرەمەین (الجوینی) گەیشت و لای ئەو زانستی کەلامی خوێند و لێبڕاوانە کۆشا و لە مەزهەب و جیاوازی و جەدەل و ئوسوڵ و زانستی باوی سەردەمەکەی شارەزابووا ئیمامی حەرەمەین بە زانستەکەی و ڕۆچوون لە واتا قوڵەکاندا و فراوانی زانیارییەکانی سەرسام بووا بۆیە گوتی: ( غەزالی دەریایەکی لێوان لێوە).

کاتێکیش ئیمامی حەرەمەین لە ساڵی (478ک) کۆچی دوایی کرد، ئەوی چووە بەغدا و بەهۆی نزیکی لە (نظام الملک الوزیر)، لە قوتابخانەی نیزامی لە بەغدا دەستی بە وانەوتنەوە کرد، ئەو (فیقە و ئوسوڵ و تەواوی تەعالیمەکانی شەریعەتی ئیسلامی دەوتەوە، بۆ ماوەی چوارساڵ لە وانە

غەزالی فەیلەسوفەکان بۆ سێ پۆل دابەش دەکات، ئەوانیش بریتین لە: دەهرییەکان، ئەوانەی باوەڕیان بە خودا نیە، دووەم پۆلیش سروشتگەراکانن (الطبیعیین)، ئەمان باوەڕیان بە خودا هەیە، بەڵام باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی و نەمری نەفس نەبوو، سێیەم پۆلیش خوداییەکانن (الالهیین)، ئەمان باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام کۆمەڵێ بیروباوەڕ و بیدعەتیان هێناوە، کە دەیانخاتە خانەی کوفرەوە!



وتنەوەدا مایەوە. تا بەتەواوی ناوبانگی لەناو خوازیارانی زانستدا لە تەواوی ناوچە ئیسلامییەکاندا بڵاوبووەوە! تەنانەت ئیمام ئەبوبەکر بن عەرەبی دەڵێت:" لە بەغدا غەزالیم بینی. لە وانەکەیدا چوارسەد مێزەربەسەر لە گەورەترین و باشترین خەڵکی ئامادەبوون و زانستییان لێوەردەگرت". ئیمامی غەزالی لەسەردەمێکدا ژیا. ڕەوتە فکریی و سیاسییەکان لەوپەڕی گەشانەوە و چالاکیدابوون. بۆیە بەشداری لە بوارگەلێکی فراوانی فکریی سەردەمەکەی خۆی کرد. لە ئەزموونێکی زۆری ڕۆحیی و عەقڵی قوڵدا ژیا - تەنانەت بەدەست چەندەها تەنگژەوە ناڵاندی- کە شوێنەواری بەرچاوی بەسەر ژیان و بیرکردنەوەکانی و تەنانەت مۆرک و تایبەتمەندییە جیامەندییەکانییەوە جێهێشت! هاوکات ئەو کاریگەرێتییە ڕۆڵی لە دیاریکردنی بواری داهێنانەکانی یان گرنگیپێدانە پسپۆڕییەکانیدا بینی! بەوپێیەی ئایا ئەو موتەکەلیم یان سۆفی یان فەیلەسوف بوو؟ ئایا ئەو دوژمنی هزری عەقڵانی بوو. یان سەرخەری تەقلید و شوێنکەوتن بوو؟ یاخود بیرمەندێک بوو. کە

باوەڕی بە پێوەرەکانی ژیری هەبوو و هاوئاوازی عەقڵگەراکان بوو! یان ئەو بیرمەندێکی تیۆریی بوو یان مامۆستا و بانگخواز و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بوو؟ ڕەنگە زیادەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین ئەو گشتێک بوو لە هەموو ئەوانە!!

ئەو ماوەیەک لە گوماندا دەژیا! لەوە دەترسا کە چاوگی ئیمانەکەی چاولێکەریی یاخود پەروەردە بێت! ئەمەش ئەوەی دەخواست، لە ڕەوتە هزرییەکانی سەردەمەکەی ڕابمێنێت! ئەوانیشی بۆ چوار ڕەوت پۆلێن کرد. کە لە چوار کۆمەڵدا خۆیان نمایش دەکرد: (کۆمەڵی موتەکەلیمین و کۆمەڵی فەیلەسوف و کۆمەڵی باطنێتی و کۆمەڵی سۆفییەکان).
پێیوابووهەموو خەمێکی کۆمەڵی موتەکەلیمین پاراستنی عەقیدە و بیروباوەڕی ئەهلی سونەت و پاسەوانی کردنییەتی لەو گومانانەی کە ئەهلی بیدعەت دروستی دەکەن.
هاوکات پێیوابوو نەنگی کوفر و بێباوەڕی بە فەیلەسوفەکانەوە بەستراونەتەوە!
بۆیە غەزالی فەیلەسوفەکان بۆ سێ پۆل دابەش دەکات، ئەوانیش بریتین لە: دەهرییەکان، ئەوانەی باوەڕیان بە خودا

بۆیە غەزالی پێیوایە بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان ئیمامی مەعسوم پێویست نییە، بەڵکو جیاوازییەکان دەکرێت لە ڕێگەی لۆجیکەوە چارەسەر بکرێن. کە ئەو لە قورئانەوە دەریهێناوە و لە کتێبەکەیدا (القسطاس المستقیم) ڕوونیکردووەتەوە.



نیـە. دووەم پۆلیـش سروشـتگەراکانن (الطبیعیین). ئەمـان باوەڕیـان بـە خـودا هەیـە. بـەلام باوەڕیـان بـە رۆژی دوایـی و نەمـری نەفس نەبـوو. سـێیەم پۆلێـش خوداییەکانـن (الالهیین). ئەمـان باوەڕیـان بـە خـودا و رۆژی دوایـی هەیـە. بـەلام کۆمەڵـێ بیروبـاوەڕ و بیدعەتییـان هێنـاوە. کـە دەیانخاتـە خانـەی کوفـرەوە! لـە نێویانیشـدا فارابـی و ئیبـن سـینا و سـوکرات و ئەفلاتـوون و ئەرسـتۆن!

ئـەو گفتوگـۆ لەگـەڵ دەهرییـەکان و سروشـتگەراکان نـاکات. لەبـەر ئـەوەی ئـەوان زندیقـن و چارەنووسـیان دیـارە! بۆیـە گفتوگۆکـردن لەگەڵیانـدا هیـچ گرنگـی و سـودێکی نیـە. بـەلام پێیوابـوو هەنـدێ زانسـتی خوداییـەکان دروسـتن وەک ماتماتیـک و لۆجیـک و سیاسـەت و ئـاکار. بـەلام هەندێکیشـیان لـە چەندەهـا پرسـدا پێچەوانـەی ئایینـن وەک (الطبیعیـات). بـەلای غەزالییـەوە هەڵـەی زۆر و نەسـازی زۆر لـە تێڕوانینەکانیانـدا هـەن. بۆیـە لـە کتیبـە بەناوبانگەکەیـدا (تهافـت الفلاسـفة) بـە دوورودرێـژی وەڵامـی ئـەو کێشـانە دەداتـەوە کـە فەیلەسـەفەکان خسـتوویانەتە ڕوو! هەروەهـا پێیوایـە کۆمەڵـی باطنێتـی کـە پێیانوایـە زانسـتەکەیان لـە ئیمامـی مەعسـومەوە وەردەگـرن! بەڵگەکەشـیان ئەوەیـە کـە هەمیشـە بۆچوونـە ناکۆکـەکان و جیاوازییـە بەردەوامەکانـی مرۆڤـەکان و عەقڵـە دژەکان. فێرکـردن و مامۆسـتا دەخـوازن!

بۆیـە غەزالـی پێیوایـە بـۆ چارەسـەری

ناکۆکییەکان ئیمامی مەعسوم پێویست نییە، بەڵکو جیاوازییەکان دەکرێت لە ڕێگەی لۆجیکەوە چارەسەر بکرێن. کە ئەو لە قورئانەوە دەریهێناوە و لە کتێبەکەیدا (القسطاس المستقیم) ڕوونیکردووەتەوە.

سەبارەت بە کۆمەڵی سۆفییەکانیش پێیوایە ڕێبازەکەیان بە زانست و کار (علم و عمل) تەواو دەبێت، ئەوان ئاستەنگەکانی بەردەم دەروون لادەبەن و لە ڕەوشتە خراپ و خەسڵەتە پیسەکان پاکی دەکەنەوە! تا دڵ لە هەموو شتێک بەتاڵ دەکرێتەوە، جگە لە یادی خودا. بۆیە بەلایەوە سۆفێتی خاوێنترین ڕێگەیە، یەکەمیان پاکردنەوەی دڵە و ڕۆچوونە لە یادی خوادا و کۆتاییەکەشی فەنابوونێکی تەواوە بە خودا!

لە ساڵی (1105) غەزالی بۆ شوێنەکەی خۆی (طوس) گەڕایەوە، لە تەنیشت ماڵەکەیدا شوێنێکی بۆ پەرستش و خەڵوەت تەرخانکرد، تا لە ساڵی (1111) کۆچی دوایی کرد.

لێرەدا ئەو پرسیارە دروست دەبێت کە مردنی باوکی غەزالی توانی خەون و ڕەوتی گەشە و پێگەیشتن و بەرەوپێشچوونی کوڕەکەی بووەستێنێت، لەکاتێکدا باوکی هەمیشە ئەو خەونەی خۆی پێدەگووت وپشتگیری دەکرد؟ یاخود ئەوە وەفایەک بوو لەلایەن غەزالییەوە بۆ هێنانەدی خەونەکەی باوکی و ئاسوودەکردنی گیانی، لەکاتێکدا هەر بە منداڵیش ئەمی جێهێشتبوو؟!



پ. ی. دکتۆر عەبدولواحید ئیدریس

# سروودی نیشتمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا

لەگەڵ سەرهەڵدانی خۆپیشاندان و ڕاپەڕین دژ بە ڕژێمی شا لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨دا، شیعری نیشتمانی و سروودی شۆڕشگێڕانەش بەشدار بوون لە جۆشدان و دنەدانی میللەت بۆ هێرش و هەڵمەت بۆ سەر دام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی شا. سروود بێژ و گۆرانیبێژە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات کە لەو کاتەوە بە چریکەی سۆز و ئاوازیان ڕۆڵی کاریگەر و بزوێنەریان دیتوە. ئەو هونەرمەندانەن: (ناسری ڕەزازی، نەجمەدینی غوڵامی، جەماڵی موفتی، ڕەشیدی فەیزنژاد، کاڵێ، تاهێری خەلیلی، کەریمی بلووری و...).

لەم لێکۆڵینەوەیە نموونەی چەند سروودێکی ئەم سروودبێژانە دەخەینە ڕوو:

١) ناسر ڕەزازی: (١٩٥٥/٦/٢١) سنە

ناسر ڕەزازی زیاتر لە ٣٣ سروود و گۆرانی شۆڕشگێڕی تۆمار کردووە. یەکەم سروودی خۆی لە ساڵی ١٩٧٨ بە ناوی (دێم و دێم) تۆمار کردووە:

«تا بمێنێ نووری چاو و هێزی پێم<br>
دێم و دێم و دێم و دێم و دێم و دێم<br>
هەرد ئەپێوم، چیا و شاخ و چۆڵ و دەشت<br>
دێم بەرەو کوردستان، بەرەو باخ و بەهەشت

ناوەرۆکی ئەم سرووده پڕه له گیانی خۆڕاگری و تەبەزین و ملمڵانێی ڕۆژگاری سپڵه و ستەمکار، تێکۆشەرێکی دووروڵات که خودی شاعیر (هێمن) خۆیەتی. به هۆی زوڵمی ڕژیمی شاهەنشا له زێدی خۆی دوور کەوتۆتەوه. خۆشەویست و ئازیزانی جێ هێشتووه. دووریەکەی هێندەی خایاندووه، لێیان دەپرسێ ئەرێ دەبێ بمناسنەوه، چونکه ئاوارەیی و تەنیایی ڕوخساریان وا گۆڕاوه. بەڵام ئەو هەر بەردەوامه له خەبات، له چیاکان دانابڕێ و شنەی پاکی کوێستان هەڵدەمژێ و سەری بەرزی نەوی ناکات.

لەم خشتەیەدا سروود و گۆرانییه نیشتمانییەکانی ناسر ڕەزازی دەخەینه ڕوو:

| [illegible] | ناوی سرود | شاعیر | ئاواز | وتنی |
|---|---|---|---|---|
| [illegible] | کارگەرین جەنگاوەرین | دڵزار | کۆن | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | پەیامی ئاگرین | حسێن بەفرین<br>خەبات عارف | کۆن | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | ئەی شەهیدان | محمدتوفیق وردی | محمدتوفیق وردی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | دێم و دێم | هێمن | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | نیشتمان | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | کوردین دلێر | شێخ ئەمین نەقشبەندی | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی. |
| [illegible] | دایه ماڵئاوا | دلێر ئیبراهیم | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | سەدەی بیستەمه | بێکەس | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | کوردستانەکەم | کامەران موکری | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | لەسەر ئارێزموه | مسلح شیخ الاسلام | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | کورد گەلۆ | مسلح شیخ الاسلام | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | سڵاو بۆ پێشمەرگه | فاتح و مسلح شیخ الاسلام | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | هیوا هیوا | ـــــ | ـــــ | ناسر ١٩٨٠ |
| [illegible] | من پێشمەرگەی کوردستانم | ئیبراهیم ئەحمەد | هۆمەر دزەیی | ناسر ١٩٨٠ |
| [illegible] | کوردینه کاتمان کاته | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی | ناسر + مەرزیه + لەیلا |
| [illegible] | کەرکووک | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | ڕۆژهەڵاتەکەم | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | زەحمەتکێشان چەکدارین | مسلح شیخ الاسلام | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | ئەی گەلی کورد | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | ئەی پێشمەرگەی هەڵمەتبەر | فاتح شیخ الاسلام | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |
| [illegible] | جەژنی نەورۆز | ع.ع شەونم | ع.ع شەونم | ناسر ڕەزازی |
| ٢٢ | گۆمەشین | ئەحمەد بازگر | ناسر ڕەزازی | ناسر ڕەزازی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٣ | نەورۆز | پیرەمێرد | ساڵح دیلان | ناسر رەزازی |
| ٢٤ | دەلالۆ | شێرکۆ بێکەس | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٢٥ | بژین، گەریلا بژین | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٢٦ | یەک وڵات یەک خەبات | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٢٧ | من شەرم ناوێ | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٢٨ | ئێمە رۆڵەی ئەرک و کار و کۆ ششین | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٢٩ | گۆشەی زیندان | قانع | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٠ | ئەنتەرناسیۆنال | مسلح شیخ الاسلام | ــــــ | ناسر رەزازی |
| ٣١ | ئافەرین قازی محەممەد | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٢ | دێم هەتا ئاسۆم لێ دیارە | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٣ | ئەی هاوڕێیان | | | ناسر رەزازی |
| ٣٤ | بۆ کرێکارانی کورد | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٥ | دەمی راپەڕینە | گۆران | غالب غەفوور | ناسر رەزازی |
| ٣٦ | بیست و حەوت ساڵە | فایەق بێکەس | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٧ | سڵاو پێشمەرگەی قارەمان | (خالید حیسامی (هێدی | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٨ | قەومی کورد | بێکەس | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٣٩ | هەڵەبجە | ــــــ | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |
| ٤٠ | تاکەی | | ناسر رەزازی | ناسر رەزازی |

نموونەی هۆنراوەی چەند سروودێک دەخەینە روو:

١) تاکەی تاکەی

«تاکەی تاکەی ئێمە وا کویلە بین

خاوەن خاک و سەربەخۆ بۆ نەبین»

ئەم سروودە پرسیارێکە و ئاراستەی هەموو کوردێک دەکرێ. بۆ تا ئێستاکە سەربەخۆ نین و چیمان لە گەلان کەمترە. هەتا کەی چەوساوە و ژێردەستە بین. لە کۆپلەکانی تر ئەوە روون دەکاتەوە. کە گەلێکی ئازاین بەلام نەزانین. لەگەڵ یەکتر راست نین و دڵ رەشین.

«رەگەزێکین خاوەن خاک و مێژوو

هەستن هەموو یەکگرن زوو بە زوو

نەسیحەت بێ بە یەکا هەڵنەچن

بە یەکیەتی لە دیلی دەرئەچین»

سروودبێژ پێمان دەڵێت مێژوو و خاکمان هەیە. کە دوو بنەمای سەرەکی بوونە دەوڵەتن. بەلام نەبوونی یەکیەتیی نێوانمان هۆکاری بە جێماویمانە. ئەگەر یەک گرین ئازادی و سەرکەوتن مسۆگەرە.



٢) کوردین و دلێر:

ئەم سروودە لەکاتی ڕووخاندنی ڕژێمی شادا لە ڕادیۆی سنە تۆمار کراوە:

«کوردین و دلێر، مەردی بێچووە شێر
تێکۆشەرین، تێکۆشەر، کۆڵنەدەرین کۆڵنەدەر»

ناوەڕۆکی ئەم سروودەش بریتییە لە بەڵێن و تێکۆشان و نەبەزین تا بە ئامانج گەیشتن و بێباک بوون لە قوربانی و خوێن بەخشین لە پێناوی کوردبوون و شەکانەوەی ئاڵای سەربەستی.

٣) گۆمەشین:

سروود یا مەقامی گۆمەشین بۆ مەرگی پێشمەرگەیەک وتراوە، کە لە گۆمی قووڵی (گۆمەشین) خنکاوە، ناوەڕۆکەکەی لە گەورەیی مرۆڤ دەدوێ، پشتیوان بە بیر وباوەڕی سۆسیالیستی دوای ڕووخاندنی ڕژێمە کۆنەپەرست و دیکتاتۆرەکان، تۆرەی دەستەمۆکردنی ئاگر و لافاو و ڕووداوە سروشتیەکانیش دێ، کە جڵەویان بکەوێتە دەست مرۆڤ.

«پێت ناخنکێندرێم گۆمەشین
ئەو ئاگرەی کە دەبینی ستەمکار هەڵدەقرچێنێ،
دەسکردمی
من کارگەرم من ڕەنجدەرم
من ئینسانی تێکۆشەری جەنگاوەرم
پاش وەی سەری سەرکوتکەرم پان کردەوە
ئەمجارە دێمە سەرینی تۆی لە خۆبایی»

٤) دەلالـۆ: ئـەم سـرووده بـۆ شـەهید (دکتـۆر جەعفـەر شـەفیعی) وتـراوە بـە نـاوی (کـوا وەختـی بـوو):

«دەلالـۆ...لالۆ... لالۆ... هەستەوە
هەموو هاتووین بە سەر سەری ئەم هەوارە نوێیەتەوە
وەک شۆڕابەی برژانگ هەڵوەریوی پایز
گلمتکی ئاڵ هەڵگەڕاوی سەر مەزارەکەت ماچ ئەکەین
دەلالـۆ... لالۆ هەستەوە
گولان بیستیان. ها لە دوور ڕا لە هەولێر و سابلاخەوە
لە قامیشلی و بۆتانەوە. بەرەو گوڵدانی دڵەکەت
چەپک چەپک وا کەوتنە ڕێ
دەلالۆ...لالۆ هەستەوە!»

ئـەم سـرووده دەنگدانـەوە و کاریگـەری زۆری لەسـەر هەسـت و ناخـی کـورد هەبـوو. بـە تایبـەت کـە خەڵـک وایـان دەزانـی ئـەم سـرووده بـۆ شـەهید (د. قاسـملوو) وتـراوە. کـە لـە کوبونـەوەو گفـت و گـۆدا شـەهید کرابـوو. بـەلام لـە راسـتیدا بـۆ شـەهید (د. جەعفـەر) وتـراوە. کـە شۆرشـگێرێکی کوردسـتانی و دکتۆرێکـی پێشـمەرگە بـوو. سـروودەکە بـاس لـە کاریگـەری مەرگـی ئـەو تێکۆشـەرە دەکات لەسـەر خەڵکـی کوردسـتان کۆسـتێکی بـە ئـازارە. سـنوورە دەسـتکردەکانی کوردسـتان خـۆی لەبـەر ناگـرێ و هەولێـر و سـابلاغ و قامیشـلی و بۆتـان لـە پرسـەدان بـۆ مەرگـی نـاوادەی د. جەعفـەر.

٥) یـەک ولات و یـەک خەبـات: ئـەم سـرووده‌ش بـاس لـە کوردسـتانی پارچـە پارچەکـراو و تیـرە و هۆزەکانـی کـورد دەکات. کـە دوژمنـان پـەرت و بلاویـان کردوویـن. بـۆ ئـەوەی بمـان چەوسـێننەوە. دەپرسـێ تاکـەی بێدەنگـی و خـەو!. تاکـەی لەنـاو کارەسـات چـاو بکەینـەوە. داوای سـەرهەڵدان و بێداربوونـەوە دەکات:

«باکوور. باشوور. رۆژهەلات
یەک ولاتە و یەک خەبات
فەیلی. دوملکی. گۆران
کرمانج. کەلهوڕ و سۆران

کوردین و یەک میللەتین

بێ جیاوازی و بێ گۆڕان»

٦)ئەی هاوڕێیان: ئەم سروودە بانگەوازی ڕەنجدەرێکی شۆڕشگێرە بۆ هاوخەباتانی، کە لە مەرگ نەترسن و تێ بکۆشن تا بە ئامانج بگەن، چونکە مل کەچ کردن و بێ دەنگی کاری مرۆڤی تێکۆشەر نییە، لە پێناو مرۆڤایەتی گیان بەخت کردن سەروەری و شانازییە:

«ئەی هاوڕان ڕەنجدەرم
شۆڕشگێر و کۆڵنەدەرم
ئەم بانگەوازی کوردستان
ئەگەیەنم بە گشت جیهان
وەرن شۆڕش گەرمە یارا
بە رابەری کرێکاران»

ناوەڕۆکی سروودەکە لە پەیامی ڕێکخراوێکی ئەنتەرناسیونالیستی دەدوێ، کە باوەڕیان تەنیا بە خەباتی چینی کرێکاران هەیە بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی عەدالەت و یەکسانخواز لە جیهان، کە ئەمەش چاونەترسی و قوربانی بێ ژماری دەوێ، چونکە ئامانجەکە گەورە و پیرۆزە.

سەرجەم سروودەکانی ناسر ڕەزازی لە خەبات و تێکۆشانی شۆڕشگێرانی کورد دەدوێ، خەمی نەتەوە و چینایەتی ئاوێزانی یەکتر بوون، بەشێک لە سروودەکانی بۆ بە پیرۆزکردنی بیری سۆسیالیستی تەرخان کردووە، لەگەڵ ئەوەش هەمیشە خەمی یەک نەبوون و ژێردەستی کورد لە سروودەکانی هاواری یەکیەتی و رابوون لە دوژمنانی ئازادی دەبیستین.

منداڵانیش سروود تۆمار دەکەن: (ساڵی ١٩٨٠ ناسر ڕەزازی کۆمەڵێک سروود بە هاوکاری چەند مۆزیکارێکی تیپی مۆزیکای مەولەوی و تیپی مۆزیکای منداڵانی بێخود لە خوێندنگەی سەرەتایی بێخود لە شاری سلێمانی بە نهێنی بڵاو دەکاتەوە، کە مۆزیکار نامدار عومەر قەرەداغی ڕۆڵی ڕێکخستن و سەرپەرستی تۆمارکردنی ئەم سروودانە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، نامدار قەرەداغی دەڵێت: «بۆ ئەم مەبەستەش تیپی مۆزیکای منداڵانیبێخود هەڵبژێردرا و پەسند کرا، کە مەترسی ئاشکرابوونی کارەکە لە هەر تیپێکی تر کەمتر بوو، چونکە منداڵانی ئەندامی تیپەکە، نەک هەر وەک هونەر پەروەردە کرابوون، بەڵکە گیانی شۆڕشگێرانە و خۆ نەویستی و خوورەوشتی جوانی کوردایەتیشیان

تیا چێنرابوو. کە کارەکەش کرا، ئەو منداڵانە تەنانەت لای دایک و باوک و کەس و کاری خۆشیان نەیاندرکاندبوو. بگرە کەس و کاری هێندێکیان لەوانەیە لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم بابەتەدا، ئەو نهێنییەیان بۆ ئاشکرا بێت».

سروودەکان بریتی بوون لە: «ئەی شەهیدان، من پێشمەرگەی کوردستانم، وڕ و کاس و سەرگەردانم، هیوا هیوا، دێم و دێم، کارگەرین جەنگاوەرین، لە بەندیخانەدا... هتد». شیعری سروودەکانیش هی (ئیبراهیم ئەحمەد، قانع، هێمن، دلزار، حسێن بەفرین، ڕێبوار، بێکەس و خالید دلیر) بوون.

٢) سرووددبێژ نەجمەدین غولامی (١٩٥٨)
نەجمەدین غولامی سرووددبێژێکی‌تری کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، کە لە کاتی ڕووخانی شای ئێراندا، سروودەکانی بوونەتە بەستەی سەر زاری ڕاپەڕیوان و هێرش بەرانی بەرەی گەل بۆ سەر دەزگا خوێنڕێژەکانی شا. نەجمەدین غولامی دەڵێت: «ڕاستیەکەی من یەکەم کەس بووم لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، کە سروودم دانا و خوێندیشمەوە. یەکەم سروودی ئەو کاتەم لەسەر شیعرێکی قانع دانا». ئەم بۆچوونەی نەجمەدین مشت و مڕی لەسەرە. ناسری ڕەزازیش ئەم بۆچوونەی پێ ڕاست نییە!. سروودەکانی نەجمەدین لە سەرەتادا ئەم سروودانەن، کە کاریگەری زۆریان لەسەر هەست و دەروونی شۆڕشگێرانی ئەم دیو و ئەو دیو هەبووە. سروودەکانی «با هەموو جووتیار و پالە و ڕەنجدەران. چەک هەڵگری خاکێکم. پێشمەرگەی قارەمان. برای جووتیار. ئەی شەهیدان. پێش کەوە. قوتابخانە و... هتد».

کۆپلەی چەند سروودێک دەخەینە ڕوو:

أ ـ با هەموو جووتیار و...

«با هەموو جووتیار و پالە و ڕەنجبەران
یەک گرن، تا دەبنە هێز و پشتیوان
هەڵگرن یەکسەر دروشمی هاوبەشی
بآجیاوازی لەسەر ڕەمز و نیشان»

سروودەکانی غولامی زۆرتر مۆرکی کردووە بە سروود کە ئازارەکانی چینایەتیان پێوەیە. بۆیە ئەو هۆنراوانەی ناخی جووتیار و کرێکاران دەردەبڕن.

گەرچی هەر ئەو چینانە سووتەمەنی شۆرشەکەیان داوا لە چین و توێژە شۆرشە پێشکەوتنخوازەکانی کورد شۆرشگێرەکان دەکا. یەک بگرن و لێک بوونە. سروودبێژ بۆ سەرکەوتنی دڕدونگ نەبن لەسەر دروشم و رەمز:

«هەڵگرن پاچ و چەک و بێل و قەڵەم
هەر لە رۆشنبیر هەتا شوان و سەپان»

ئەم کۆپلەیە ئەو راستییە نیشان دەدات. بیری رووناک پێشەنگ نەبن. شۆرش و ئەگەر قەڵەم شانبەشانی چەکەکانی قوربانیەکان بە هەدەر دەچن و رەنج بە تر لە مەیدانی خەبات رۆڵی نەبن و خەسار دەبن.

ب ـ چەک هەڵگری خاکێکم:

«چەک هەڵگری خاکێکم دوژمن لەسەری زاڵە
من بوومەتە بێگانە بێگانە خاوەن ماڵە»

ئەم سروودەش لە پێشمەرگەی خاوەنی نیشتمانەکەی. بۆیە چەک کورد دەدوێ. کە نیشتمانەکەی هەڵگرتنەکەی نەک زۆر رەوایە. بەڵکوو داگیر و دابەش کراوە و خۆی بووە بە پیرۆزیشە:
بێگانە و داگیرکەرەکان خۆیان کردۆتە

«ئەم رێگەیەی کە گرتووم دوارۆژی لە لام روونە
یان سەرکەوتنی کوردە یان مەرگ و تیاچوونە»

برای پێشمەرگە بە باوەڕی بەهێزەوە رێی خەباتی گرتووە. دوو دڵ و ڕاڕا نییە لە تێکۆشانەکەی. دوو ئەگەری لە پێش خۆی داناوە. یان سەرکەوتنی شۆرش یا شەهیدبوون. ئەمەش لە رەوایی کێشەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە. کە هەرگیز بیر لە کۆڵدان و بەزین نەکاتەوە.

پ ـ قوتابخانە: ناوەرۆکی ئەم سرووده باس لە مامۆستایەکی ئازادیخواز و تێکۆشەر دەکات. کە لە گوندێکی کوردستان دەیەوێ چاوی منداڵان بکاتەوە. چی تر وشە ترسێنەر و خەماوییەکان ئەزبەر نەکەن و فێری ئازادی و تێکۆشان و یەکیەتی و یەکگرتن

و یارمەتییان دەکات. ئەم سروودە چیرۆک ئامێزە، وانەیەکی شۆرشگێڕانەیە کە نەوەی نوێی پێ گۆش دەکرێ. بێگومان ڕێبوارە چاو نەترسەکانی ئەم قوتابخانە ئازادیخوازانە، لە وڵاتە دیکتاتۆر و کۆنەپەرستەکان، باجی وانەکانیان سەری بەرزی خۆیتیان، کە ئەمەشیان وانەیەکیترە بۆ منداڵانی لە ئازادی ژیان بێبەش:

«ب ــ وەکوو بیرەوەر
ت ــ وێنەی تێکۆشەر
س ــ وەکوو سەربەستی
سەر و سێدارە و سستی
خ ــ بە وێنەی خەبات
خوێندن و خوێن و خەڵات
ک ــ وێنەی کوردستان
کورد و کۆمەڵ و کوێستان
ی ــ وەکوو یەکیەتی
یەکگرتن و یارمەتی»

ت ـ پێشمەرگەی قارەمان: ئەم سروودە لە دڵسۆزی و قارەمانیەتی و گیانبازی و بێ باکی پێشمەرگە دەدوێ. لە دوای بڵاوبوونەوەی وێردی سەر زاری شۆرشگێڕانی کوردە، کە گیانی بەرەنگاری و نەسرەوتن لە لایان بەهێز دەکات:

«ئەی پێشمەرگەی قارەمان
ئەی گیانفیدای کوردستان
ئەی تاقەشێری کوێستان
پارتیزانی بەشەرەف
برای ئاریی جی لە شان»

لە کۆپلەکانی تری سروودەکە دڵنیایەک لای میللەت هەیە، کە تۆڵەسێنی ماف و بەدیهێنەری ئامانجەکانی گەل و هەوێنی بووژانەوە و گەشانەوەی نیشتمان لە لوولەی چەکی ئەو پێشمەرگانەدایە، کە لە خەباتی بێ وچان دان:

«هەر وەک رۆژ لێمان روونە
کە ئەستێنن مافمان
خۆشی دێنن بۆ گەلمان
وڵات ئەبووژێننەوە
سەربەرز ئەکەن کوردستان»

سروودەکانی نەجمەدین غوڵامی بەشێکی بۆ نەتەوە و نیشتمانی پارچە پارچەکراوی کوردستان و بەشێکیش بۆ چینی زەحمەتکێشی پاڵە و جووتیار و کرێکاران وتووە. سەرجەم سروودەکانی لە کات و شوێنی خۆی کاریگەریان لەسەر جۆشدانی هەستی پاکی شۆڕشگێر و چەوساوان هەیە بۆ بەرەنگاری و تێکۆشان دژ بە زۆرداران و سەر نەوی کردن بۆیان و بەردەوام بوون لە شۆڕش و راپەڕین تا دوا لوتکەی ئامانج.

٣) تایەری خەلیلی: سروودبێژ تایەری خەلیلی خاوەنی چەند سروودێکی نیشتمانی و بەرەنگارییە. کە رۆژگارێک کاریگەری زۆریان لە جۆشدانی شۆڕشگێرانی هەردوو دیوی کوردستان (رۆژهەڵات ـ باشوور) هەبوو بۆ نەبەزین و بێ پەروابوون لە قوربانیدان بۆ گەیشتن بە ئامانجی گەل. نموونەی سروودەکانی (راپەڕین. هێزی پێشمەرگە. هەر دێمەوە. شیوەنی ئاگراوی. قۆچی قوربانی و... هتد). کۆپلەی چەند سروودێک دەخەینە روو.

أ ـ هێزی پێشمەرگە: ئەم سروودە لە گەرمەی شۆڕشی نوێ وێردی سەرزاری پێشمەرگە بوو. چونکە هەڵگری پەیامی بیر و بڕوای پێشمەرگەیەکی گیان بەخت کردووە بۆ دایک و هاوڕێکانی. کە هەرگیز نابەزن و شەهیدبوونیش مایەی شانازییە. چیای (قەندیل)یش رەمزی سەربەرزی و پیرۆزییە. ئەو دوندەی قەت بە دەستی دوژمن گلاو نەبووە.

«لە قەندیلی سەربەرزەوە وەڵامت بۆ دەنێرمەوە
شەهیدبوونم شانازییە. هاوڕێ رەنگە نەتبینمەوە
هێزی پێشمەرگە نابەزن هەموو شۆڕشگێرن ئەورۆ
شەهیدبوونمان شانازییە. دایکان بۆمان مەکەن رۆڕۆ»

لـە کۆپلەکانـی تـری سـروودەکە نـاوی شـەهیدانی ڕێبـازی سۆسـیالیزم و کوردایەتـی (شـەهید ئـارام، شـەهید فـواد مسـتەفا سـوڵتانی) و بیرمەنـدی کۆمەنیـزم (لنیـن) هاتـووە، کـە داوا لـە هاوڕێکانـی دەکات ڕێگایـان بـەر نـەدەن و ڕۆژی هیمـەت و هێرشـە بـۆ سـەر دوژمـن و وادەی هەڵکردنـی ئـاڵای سـوورە، ئەمـەش دەرەنجامـی کاریگـەری ئـەو ڕێکخـراوە (مارکسـی لینین)یانـەی ئـەو سـەردەم بـووە لەسـەر سـروودبێژ، کـە لـەو ڕوانگەیـەوە ئاسـۆی ڕوونـی دوارۆژی ئازادیـان دەدی و سووربوونیان لەسـەر ئـەم ڕێبـازە بـە هـۆی سـەرکەوتن دەزانـی:

«هاوڕێ ئارام (فواد) لەبیر مەکەن
ڕێگای لینین قەت بەر مەدەن
هاوڕێیان ڕۆژی هیمەتە
جەرگی دوژمن لەت لەتە
ڕۆژی تۆڵەسەندنە
بەیداخی سوور هەڵکردنە»

ب ـ هـەر دێمـەوە، شـیعری ئـازاد ئەحمـەد: ئـەم سـروودە بـاس لـە گەڕانـەوەی شۆڕشـگێڕێک بـۆ لای دڵدارەکـەی دەکات، بـەڵام چ کاتێـک؟ ئـەو کاتـەی جـەور و سـتەم لـە کوردسـتان نەمێنـێ، شـادیی و خۆشـەویسـتی نـەک هەمـوو کونجێکـی ئـەم وڵاتـە بەڵکـوو هەندەرانیـش بگرێتـەوە، دیـارە بیـری سوسـیالیزم بـە سـەر ئـەم سروودەشـدا زاڵـە و جیهانـی یەکسـانی و دادپـەروەری و ئـازادی و ئاسـوودەیی بـە سـەرکەوتنی هەڵگرانـی ئـەم بیـرە دێتـە دی:

«هەر دێمەوە چۆن نەیمەوە
ڕۆژێ لە ڕۆژان دێمەوە
دەست لەناو دەست دڵدارەکەم ئەنێمەوە
تاریکایی و جەور و ستەم
گشت ئەخەمە ژێر پێمەوە
لاوک و حەیران بۆ ئازادی کوردستانم ئەڵێمەوە»

پ ــ قۆچی قوربانی، شیعری مارف عومەر گوڵ: ناوەڕۆکی سروودەکە بریتییە لە گەیاندنی پەیامی پێشمەرگەیەکی کورد، کە بەشی زۆری سروودە بەرەنگارییەکان، لە دەربڕینی ئەو باوەڕە بابەش نین، کە تێکۆشەری ڕێی ئازادی گەل داوایان لێ دەکات ئەگەر شەهید بوو، بۆی نەگرین، چونکە گریان کردەوەی بێدەسەڵاتانە و ئەویش لە لوتکەی باوەڕ و سەربەرزییەوە بە خوێنی سووری شەوی مەینەت و ئازاری کردۆتە چراخان، ئەو پێناوی هێنانی مژدەی شادی و رواندنی تۆوی ژینێکی ئاسوودە و پڕ خۆشییە بۆ گەل:

«قۆچی قوربانی وڵاتم
سووتەمەنی ڕێی خەباتم
لە پرسەمەدا نەکەن بگرین
ڕزگارییە ڕێی ئاواتم
ڕابەری ڕێی تێکۆشانم
کێوی بروا و کۆڵنەدانم
شەوی مەینەت دادەگیرسێ
بیر و هەست و هۆش و گیانم»

ت ــ چی بوو تاوانی: ئەم سروودە لە بێتاوانی لە سێدارەدراوانی ڕۆڵەی کورد دەدوێ، کە جگە لە دڵسۆزی بۆ نیشتمان و ڕق لە داگیرکەران شتێکی تریان نەکردووە، دیارە خۆشەویستی نیشتمانیش نەک تاوانە، بەڵکوو ئەوپەڕی مرۆڤ دۆستییە، کۆپلەکانی تری سروودەکە، دوژمن دڵنیا دەکات بە سێدارە و ڕەشەکوژی کورد نابڕێتەوە، بەڵکوو ڕۆژبەڕۆژ لە سایەی خەباتی بێوچان لە ئامانج نزیک دەبینەوە، پێیان دەڵێت تۆپ و تەیارەی ئێوە شەڕی بیر و باوەڕ و مێژووی پڕ سەروەری ئێمەی پێ ناکرێ، ئەو ڕۆژە هەر دێ پشت بە خۆمان بە سەرکەوتن دەگەین، ئەوکات ڕیسوایی بۆ ئەوانە دەبێ کە بوونەتە داردەستی بێگانە:

«چی بوو تاوانی ئەوانەی وا لە سێدارە دران
غەیری دڵسۆزی وڵات و دوژمنی داگیرکەران
قوڕ بە سەرتان ئێوە خاوەن تۆپ و تەیارەی شەڕن

**میللەتی من خاوەنی تەئریخ و بیر و باوەڕن**
**گەل بە هێزی دەست و بازوو پشتی خۆی رزگار ئەبێ**
**هەرچی برِوای کرد بە غەیرە کاری نائەموار ئەبێ»**

ج ـــ سرووەدی راپەڕین: ئەم سرووەدە تێکۆشەران هان دەدا لە خەبات و تێکۆشان بێزار نەبن و لە چاندنی تۆوی خۆشەویستی و رەفتاری چاک سلا نەکەنەوە. ئەوەی لە بەرەی گەل دابڕێ، جگە لە ریسوابوون هیچی تر نادوورێتەوە:

«ژیان وەرزێکە رۆژگار درێژە
تۆوی خەبات و چاکە بڕێژە
ئەوەی پشت لەگەل.....
تۆ بەردی تۆڵەی لا بهاوێژە»

بۆ جۆشدانی گیانی خۆڕاگری و نەبەزین ئەم راستییە وەبیر خەڵک دێنێتەوە، کە قەڵای زۆرداری چەندە قایم و بەرز بێ، کە گەل راپەڕی، نەک قەڵا دەڕووخێ، بەڵکوو هەڵمژینی هەناسەیەکی ئەم ولاتەشیان لێ یاساغ دەبێ. بیری ئەم سرووەدە پڕ لە ئومێد و هیوایە. سەنگەرەکانی پێشمەرگە چڕ تر و نەبەزیوتر دەکا:

«دەستی زۆرداران قەت ناگاتە سەر
داری دوژمنان قەت ناگاتە بەر
کە گەل خرۆشا لە هەموو لاوە
سوپای دوژمنان قوڕ دەنێتە سەر»

سرووەدەکانی تایەری خەلیلی تۆوی قەندیلی باوەڕ لە هەستی تێکۆشەران دەڕوێنێ و وشە و ئاوازی پڕە لە بەرەنگاری و خۆشەویستی نیشتمان. سرووەدەکانی هیوابەخشن و وەرەبەرزکەرەوەی شۆڕشگێرانە لەکاتی شکست و بێهێزی شۆڕشدا، هەوێنی جۆشدانی هەڵمەت و هێرشی گیانبازەکانی کوردستانە بۆ سەر مۆڵگەکانی تاوان و چەوسێنەرانی مرۆڤی کورد لە سەدەی جیهانگیری.

٤) جەمالا موفتی (١٩٥٦ ـ ١٩٨١): هونەرمەندێکی تری کوردستانی رۆژهەلاتە، کە کۆمەڵێک سرووەدی

شۆرشــگێرانە و نیشــتمانی و چینایەتــی نامــری چاوەکانــم، کارگەریــن). نموونــەی تۆمــار کــردووە، وەک: (ئەنتەر ناســیۆنالا، کاک کۆپلەیــەک لــە ســروودی (کــوردە راپــەرە): شــوان، مــام رەحمــان، تەیــاری بەختیــاری، تــۆ

سەدەی بیستەمە کوردە تۆ راپەرە
تەواوی مێژووت بە خوێن پەڕ پەرە
تەواوی گەلان، هەموویان سەربەخۆن
لە کوردستاندا زۆردار خوێنمان دەخۆن
زانا بین، تێکۆشین دەور دەوری ئێمەیە
وڵات چاوەڕێ شۆڕشی ئێمەیە

نموونەیەک لە سروودی (مام رەحمان) کە شیعری رێبواری شاعیرە، دەڵێت:

«مام رەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەیگیر، پڕ کینە، لە زاڵم راسا
سێبەری ئەخست بەسەر هەژارا
چرایێ رووناک لە رێی جووتیارا
ئازا و بەغیرەت بەرانبەر زۆردار
برای بڕ بڕەی پشتی، کرێکار
خۆی و منداڵ و هاوماڵەکانی
گشت بێبەری بوون لە رەنجی شانی
بۆیە وا هەستا و دەستی دایە داس
تا ژێر و ژوور بێ دەوری حەق نەناس
هێندەی دادڕی پەردەی فێڵی شا
دەوڵەت لێی ترسا و لە دێ دەرکرا»

٥) کاڵێ (غولامعەلی ئاتەشین): سرووبێژێکی تری کوردستانی رۆژهەلاتە، کە سروودەکانی زیاتر مۆرکی چینایەتیان پێوە دیارە. نموونەی سروودەکانی وەک: (کرێکارانی جیهان یەک گرن، ای ئایار، من بە چەکم، بەیان. . . .هتد)




# ئاوابوون

زۆرن ئەو ڕووداوە مێژووییانەی کە بێگومان لە زۆربەی کۆمەڵگە و گەل و نەتەوەکانی دوونیادا کە ڕەنگە تاکو ئێستا لێرە و لەوێ چووبێتە بەر باس . کە هەندێک لەمانە بە تراجیدیا و هەندێکی تریش بە کۆمیدیا دەچنە نێو ئەدەبیاتی گەلانەوە و دەبنە بەشێک لە کلتوور و نەریت و سیماکانی تایبەتمەندی ئەو جوگرافیایەی کە دواتر نازناوی شاری پێ درا و بوو بە چەقی ململانێی فکری و فەرهەنگی و فەلسەفی و سیاسی و ئابووری و نیشتیمانی . بەڵێ ئێرە شارە . ئەو شارەی کە سەرەڕای ئەوەی تەمەنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٢٤٥ ساڵ پێش ئێستا کە لەلایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە بەردی

بناغەی دانرا و لە چەند گەڕەک و کۆڵان و کوچەیەک دامەزرا کە ( مەڵکەندی و کانی ئاسکان ) ڕاستە کە ئەم شارە زۆر بە خێرایی بوو بە سەنتەری بازرگانی نێوان چەند وڵاتێک لە ناوچەکەدا و زۆر بە خێرایی بوو بە خاوەنی پانتاییەکی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری لە دوونیاوە پیشەوەران و کاسبکاران و زانست خوازان و کەسانی خاوەن ڕۆح و هزر و نیشتمان ڕوویان تێ کرد

هاوشێوەی شارەکانی تری کوردستان و ناوچەکە و دونیا و داگیرکەرەکان و زلهێزەکانی جیهانی سیاسی بەبەردەوامی هەوڵیان داوە کە هەژموونی خۆیان بپارێزن و بەرژەوەندیەکانیان لەم شارەدا جێگیرتر بێت تەنانەت سەرەڕای دابەش کردنی کوردستانی گەورە و پاشان



پاش پەیماننامەی شوومی لۆزان کە لە بری پەیماننامەی ( سیڤەر ) لەلایەن وڵاتە سەرکەوتووەکانی جەنگەوە واژۆ کرا لە سویسرا لە ٤ ی تەمووزی ١٩٢٣ کە تیایدا ئەم عێراقە نوێیەی تیا دروست کرا و ئەم شارە بوو بە بەشێک لە ئیدارەکانی نەخشەی عێراق . نامەوێت زیاتر بچمە ناوەڕۆکی چۆنیەتی گۆڕینی ڕێکەوتن نامەی سیڤەر بە ڕێکەوتن نامەیەکی تر کە ڕێکەوتن نامەی لۆزانە بە شێوەیەک لە شێوەکان دوای دۆڕانی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی جیهانی یەکەم دا ناچار کرا بە واژۆ کردنی ئەم ڕێکەوتن نامەیە . هەر ئەوەندەی دەمەوێ بچمە سەر یەکێک لە کاریگەریەکان و لێکەوتەکانی دروست کردنی ئەم دەوڵەتە و ئەم ڕووداوەی کە مەبەستمە بیکەم بە تەوەری ئاوڕ دانەوەیەک لە مێژووی پرشنگدار و جوانی و پیرۆزی و پڕ لە قارەمانی و جوامێری ئەو کەسانەی کە لەم شارەدا و لێرەدا بەژدار بوون لە بونیاد نان یان لە ئیدارەدان یان لە ژیان تێیدا لە ڕوو تێکردن و جێگیر بوون و پاشان توانەوەیان لە کلتوور و نەریت و دەوڵەمەند کردنی شار بە جوانیان کە لە خۆیاندا هەبووە و کە خۆشیان لەگەڵ خۆیاندا لە وڵاتەکانی خۆیانەوە هێناویانە هەر بۆیە ئەم شارە زۆر بە قۆناغی مێژوودا تێدەپەڕێت و باوەش بۆ سەرجەم پرسی نشتمانی و نەتەوەیی و پرسی فکری و هونەری و ڕۆشنبیری دەکاتەوە خۆی دەکات بە دایک بۆ قەزیەی کوردی و دەبێتە سەرچاوەی وزەی پڕ ئومید بۆ گەل و کۆمەڵانی خەڵک لە هەموو ڕوویەکەوە . دوای هەرەس هێنانی هەر وڵاتێک یان ڕووخانی هەر ڕژێمێک یان هەر سیستمێکی سیاسی لە کۆندا جا لە سەردەمی ئیمارەت و ئیمپراتۆریەت و شارستانیەتەکانی پێشتر یان لە دیوی سیاسی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت وولات و سیستمێکە بۆ گوومان خاو خێزان و وەچەی ئەم دەسەڵات دارانە هاوشێوەی تەخت و دەسەڵات و حوکمڕانیەکان وەکو شوشەی شکاو هەر پارچەیەکیان

دەکەوێتە کووچە و کون و بنکەیەکەوە جا بە چ هۆکارێک بێت کە من زیاتر پەیوەستی بابەتەکە دەخەمە سەر دیوە مێژوویەکەیەوە نەک لە هۆکاری یان باشی یان خراپی ئەو تاقمەی کە لە هەر کۆمەڵێک بێت یان هەر زەمەنێک حوکمڕانیان کردبێت و هۆکار و فاکتەری درووست بوونیان یان لەناو چوونیان بێت . بۆیە ناچار دێڕەکانم چڕ تر و ورد تر بکەمەوە و بچمە سەر ئەم کەسە کە دەرەنجامی ڕووداوێکی هاو شێوە کە ئاماژەم پێ کرد کە ئەویش ( غولام حسین ) کە بە هۆی ڕووداوێکی هاتوو چۆوە گیانی لەدەست دا و دونیایەک لە نهێنی و مێژووی شاراوەی خۆی بە دوای خۆی دا بەجێ هێشت کە پاش تێپەڕ بوونی ٤٥ ساڵ لە تەمەنی خۆی لە ژێر ناو و لە ژێر کلتور و لە ژێر ئەم هەموو ڕووداوانەی کە بەم ناوچەوە بەسەر ئەم میللەتەوە بە سەر ئەم نیشتمانەدا ڕووی دا کە ئەم کەسە تێیدا ژیانی بەسەر بردووە . کاتێک کە ئەم کەسە لە نەخۆش خانەیە لە شاری بەغداد کوڕەکەی ئاگادار

کاتێک سلطان عبد الحمید بە سێ قۆناغ قەتل عامی ئەرمەنەکانی کردووە و ڕازی نەبووم ڕووم کردۆتە ئێرە و بە نازناوێکی خوازراوەوە لێرە ژیاوم و بووم بە بەشێک لەم شارە جوانە و خۆشم بە بەشێکی دانەبڕاوی ئەم شارە داناوە ، بڕۆ بۆ شار و لە ماڵی خۆمان لە پشت وێنەیەک کە بە تەنەکە لە چوار چێوەم گرتووە شوو ناس و پێ ناس و بەڵگەکانم تێدا شاردۆتەوە



دەکاتـــەوە کـــە پێـــی دەڵێـــت کـــوڕم مـــن نـــە خەڵکـــی ئـــەم شـــارەم و نـــە کـــوردم نـــە ناویشـــم غولامـــە مـــن نـــاوم ( عبـــاس ) ە نـــەوەی ســـلطان مـــورادی عثمانیـــم و کاتێـــک ســـلطان عبـــد الحمیـــد بـــە ســـێ قۆنـــاغ قەتـــل عامـــی ئەرمەنەکانـــی کـــردووە و ڕازی نەبـــووم ڕووم کردۆتـــە ئێـــرە و بـــە نازناوێکـــی خـــوازراوەوە لێـــرە ژیـــاوم و بـــووم بـــە بەشـــێک لـــەم شـــارە جوانـــە و خۆشـــم بـــە بەشـــێکی دانەبـــڕاوی ئـــەم شـــارە دانـــاوە . بـــڕۆ بـــۆ شـــار و لـــە ماڵـــی خۆمـــان لـــە پشـــت وێنەیـــەک کـــە بـــە تەنەکـــە لـــە چـــوار چێـــوەم گرتـــووە شـــوو نـــاس و پـــێ نـــاس و بەڵگەکانـــم تێـــدا شـــاردۆتەوە ئـــەو ڕاســـتیە دەســـەلمێنێت کـــە ئێســـتا بـــۆم ئاشـــکرا کردیـــت . ئـــەم کـــوڕەش زۆر بـــە خێرایـــی دەگـــەڕێتـــەوە بـــۆ شـــار ڕاســـپاردەکەی باوکـــی جێبەجـــێ دەکات و دەیدۆزێتـــەوە و باوکـــی گیـــان لەدەســـت دەدات وە پـــاش ئـــاگادار کردنـــەوەی چەنـــد کەســـێک و چەنـــد لایەنێـــک ئـــەم ڕاســـپاردانە بـــە بڕیـــاری دادگا و بـــە شـــێوازێکی مێژوویـــی ڕاس دەکرێتـــەوە لێـــرەدا نـــەوەی ســـلطان مـــراد کـــە ئێســـتا خەڵکـــی شـــارە و لـــە ژیانـــدا نەمـــاوە بـــۆی و کۆچـــی دووای کـــردووە بیـــر لـــەوە دەکاتـــەوە کە باوکـــی واتـــە واتـــا غولامـــی تەنەکـــە جـــی کانێســـکانی کـــە دواتـــر بـــوو بـــە عبـــاس پاشـــان نـــەوەی ســـلطان مـــرادی

عثمانـــی کاتێـــک هەســـتی دەکـــرد باوکـــی زمانـــی جیـــاوازە لـــە زمـــان و زاراوەی ئـــەو شـــارە و تۆزێـــک بـــە تـــۆن و شـــێوازێکی تـــر قســـە دەکات کـــە تۆزێـــک پێـــوەی دیـــارە کـــە خەڵکـــی شـــار نەبـــووە زۆر جـــار پێـــی وتـــووە کـــە بـــاوە تـــۆ بۆچـــی بـــێ کەســـیت خـــاڵ مـــام خـــزم و کەســـو کارمـــان نیـــە زۆر تـــوورە دەبـــوو چوونکـــە دەیویســـت ئـــەم نهێنیانـــە ئاشـــکرا نەبێـــت . پاشـــان شـــەوانە وەک چیرۆکـــەوان چیرۆکـــی ســـوڵتانە عثمانیـــەکان و ڕووداوەکان و نهێنیەکانـــی نێـــو کۆشـــک و تەلارەکانـــی بـــۆ دەگێڕایـــەوە ئەوســـا بـــە هـــۆی منداڵـــی بوونیـــەوە حـــەزی لـــەم جـــۆرە حیکایەتانـــە بـــووە کـــە وایزانیـــوە تەنیـــا چیرۆکـــە و مێـــژووە و حیکایەتـــە بـــەڵام دوواتـــر کـــە باوکـــی خـــۆی ئاشـــکرا دەکات بـــۆی دەرەکەوێـــت کـــە ئەوانـــە چیرۆکـــی ڕاســـتەقینەی باوکـــی خۆیتـــی بەڵـــێ ئێـــرە شـــارە . لـــە گەڕەکـــی کانـــی ئاســـکاندا نـــەوەی ســـلطان مـــرادی عثمانـــی تیـــا ژیـــا و کۆچـــی دوایـــی کـــرد وە بـــوو بـــە پەناگەیـــەک و ئارامکـــەی نـــەوەی یەکێـــک لـــە گـــەورە تریـــن ئیمپراتۆریەکانـــی جیهـــان و ســـەر زەوی بـــۆ نزیکـــەی ٧٠٠ ســـاڵ حوکمـــی کـــرد ئێـــرە ســـلێمانیە شـــاری هەڵمـــەت و قوربانیـــە و شـــارە حەیاتەکـــە و شـــارەکەی بابـــان

لە بیرم دێت سولە یمانی

کە دارو الملک ی بابان بوو

نە مە حکومی عە جە م

نە سوخرە کێشی ئالی عوسمان بوو

لە بە رقابی سە راسە فیان دەبە ست شێخ و مە لا و زاهید

مە تافی کە عبە بۆ ئە رباب حاجە ت گردی سە یوان

# بیرەوەرییەکانی مستەر هەمەر



بەرزان عەباس بەدری

## گەڕانەوە بۆ لەندەن بەمەبەستی پرس و ڕاوێژ

دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک لە (بەغداد) مامەوە. فەرمانم پێ کرا کە بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ لەندەن. دوای گەیشتنم لەگەڵ بەرپرسەکەم و ئەو دەزگایەی کەکارم تێدا دەکرد کۆبومەوە و هەموو ئەو بابەت و زانیاریانەم بۆ باس کردن کە لەو سەفەرە دوور و درێژەم دەستم کەوتبوو. خۆش بەختانە بووە مایەی گرنگی پێدان و قبوڵ کردن. لەبەر ئەوەی زانیاری زۆر وردی تێدا بوو لەسەر عێراق. هەروەها باسیشیان لەو ڕاپۆرتانە کرد کە ئەو کاتەی لە عێراق بووم و وتیان هەموو ڕاپۆرتەکانمان بەدەست گەیشتووە. ئەوەشم بۆ ئاشکرا بوو(صەفیە) ی هاوسەری (محەمەد عبدالوەهاب) لە (بەسرە) بەهەمان شێوە ڕاپۆرتی بۆ ناردوون و کاتێک بەراوردیان کردووە ڕاستی و دروستی ڕاپۆرتەکەی منیان بۆ دەر کەوتووە. هەروەها بابەتێکی هەستیارم ئاشکرا کرد. ئەویش ئەوە بوو بەدرێژایی ئەو ماوەیەی من لە عێراق کارم دەکرد لە ژێر چاودێری دەزگاکەمدا بووم!

پاشان بەرپرسەکەم کۆبونەوەیەکی بۆ ڕێکخستم لەگەڵ بەرپرسی ئەو دەزگایەی کە کارم تێدا دەکرد. کاتێک سەردانم کرد و لە

نوسینگەکەی پێشوازییەکی گەرمی لێ کردم، تەواو جیاواز بوو لەو پێشوازیەی کە لە ئاستانا گەڕامەوە، وا دیار بوو ڕازی بوون لە کارەکەم و ئەو ئەرکانەی پێی هەستاوم.

هەروەها بەرپرسەکەم خۆشحاڵی خۆی دەربڕی سەبارەت بەو کاریگەریەی کە لەسەر (محەمەد)م دروست کردووە و وتی: ئامانجی سەرەکیمانە و پێداگریشی لەوە کرد کە هەوڵی خۆم بخەمە گەڕ بەمەبەستی زیاتر نزیک بوونەوە لە شێخ، هەروەها ئەوەشی پێ ڕاگەیاندم لەوکاتەی شێخت جێهێشتووە هەر لەسەر بیروبۆچونەکانی خۆی ماوە، بەرپرسی دەزگاکەم باسی لەوەش کرد هەندێک لە سیخوڕەکانمان لە ئەصفەهان پەیوەندیان پێوە کردوین و پێیان ڕاگەیاندوین کەشێخ بیرکردنەوەی بە چ شێوەیەکە، ئەو قسانەی بەرپرسی دەزگاکەم سەرنجی ڕاکێشام و توشی سەرسوڕمانی کردم، لەبەر ئەوەی شێخ نهێنیەکانی لای کەس باس ناکات! دوای ئەوەی (شێخ)م بینی، بۆم ڕوون بووەوە کە کەسێک بەناوی (عبدالکریم) لە ئەصفەهان پەیوەندی پێوە کردووە و بەشێخی وتووە کە برای منە و وردەکاری زۆری لەبارەوە دەزانێت

و هەندێک نهێنی لەلا درکاندووە، بەم شێوەیە توانیویەتی فریوی بدات و متمانەی لەلا دروست بکات، محەمەد عبدالوهاب باسی لەوەش کرد..(صەفیە) دێت بۆ ئەصفەهان و بۆ ماوەی دوو مانگ لەلای ماوەتەوە و دوای ئەوە لەگەڵ (عبدالکریم) دەچن بۆ (شیراز) و لەوێ ئافرەتێکی جوانی بەناوی (ئاسیا) پێ دەناسێنێت و وەک خۆی باسی لێوە کرد زۆر جوانتر بووە لە صەفیە و هەروەها خۆشترین ساتەکانی تەمەنی لەگەڵدا بەڕێ کردووە. پاشان ئەوەم بۆدەرکەوت کە عبدالکریم ناوێکی خوازراوی کەسێکی (کریستیان-مەسیحی) دانیشتووی (جولفای) نزیک شاری (ئەصفەهان) ە و یەکێک بووە لە سیخوڕەکانی دەزگاکەمان، هەروەها (ئاسیا) ئافرەتێکی جووە و خەڵکی شیرازە و بەهەمان شێوە سیخوڕی دەزگاکەمان بووە، بەم شێوەیە توانیمان بەتەواوی کۆنترۆڵی (محمد عبدالوهاب) بکەین، بەمەبەستی بەکارهێنانی لەداهاتوودا! ئەمەش بووە هەوێنی ئەو ئامانجەی کە دەزگاکەمان هەوڵی بۆدەدات لەپێناو ئاسایشی شانشینەکەمان و دەسەڵاتەکەی! دوای ئەوەی بەئامادەبوونی بەرپرسەکەم و بەرپرسی

دەزگاکەمان و بەئامادەبوونی دووکەس کەبەهەمان شێوە کارمەندی دەزگاکە بوون و من نەم دەناسین پێشتر ئەوانم نەبینیبوو، لەو دانیشتنەدا بەڕێوبەری دەزگاکە ستایشی کردم و پێی وتم کە تۆیەکێکیت لە کارمەندە هەرە دڵسۆز و چالاکەکانی دەزگاکەمان هەربۆیە شایستەی ئەوەیت بەرزترین پلەوپایەت هەبێت لەدەزگاکەمان و بەپێزانینەوە مەدالیای شکۆ و کارامەییت پێشکەش دەکەین هەروەها باسی لەوەش کرد کە بەرپرسەکەم کۆمەڵێک زانیاری نهێنیت دەداتێ بۆئەوەی لەئەرکەکەتدا سوودی لێوەربگریت پاشان بۆماوەی دە ڕۆژ مۆڵەتیان پێدام بۆئەوەی سەردانی خێزانەکەم بکەم.

دوای ئەوەی لەبارەگای دەزگا کۆبونەوەم تەواو بوو لەگەڵ بەرپرسەکەم و بەرپرسی دەزگاکە بەرەو ماڵەوە بەڕێ کەوتم، کاتێک چاوم بە کوڕە بچوکەکەم کەوت زۆر دڵخۆش بووم و شێوەی نزیک بوو لە شێوەی خۆم، تازە فێری هەندێک ووشە ببوو، هەروەها دەیتوانی کەمێک ڕێ بکات، کاتێک کەسەیرم دەکرد زۆر دڵخۆش دەبووم و هەستم دەکرد هەموو دنیا موڵکی منە و لەخۆشیدا خەریک بوو بفڕم، لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو دوور بووم لە کەشی خانەوادە و منداڵەکەم و نیشتمانەکەم! هەروەها سەردانی یەکێک لە پورەکانم کرد لەبەر ئەوەی کەمێک پیر ببوو، سەرەڕای ئەوەی خۆشم زۆرم خۆشدەویست، بەڵام بەداخەوە ئەوە دوا دیدارم بوو لەگەڵ پورم و ئیدی دوای ئەوە نەمبینیەوە لەبەر ئەوەی کۆچی دوایی کرد، کاتێک هەواڵی مەرگیم بیست زۆر خەمبار بووم و لە ناخەوە ئازاری دام.

ئەو دە ڕۆژە کە لەناو خێزانەکەمدا بووم زۆر بە خێرایی تەواو بوو، وەک ئەوەی یەک سەعات بووبێت، وەک دەوترێت کاتە خۆشەکان بەشێوەیەک تەواو دەبن هەر هەستی پێ ناکەیت بەڵام ڕۆژە ناخۆشەکان وەک بڵێی بە یەک سەدە تەواو دەبن، لەو ماوەیەدا ئەو ڕۆژانەم بیر کەوتەوە کە لە عێراق و لەشاری نەجەف نەخۆش کەوتم، بەڕاستی ڕۆژگارێکی ناخۆش بوو، تەواو وەک ئەوەی باسم کرد ڕۆژێکم بە ساڵێک لێ دەڕۆی، هەتا ئێستا تاڵی ئەو ڕۆژانەم لەیاد ناچێت، هەتا ئەو ئاستەی ئەو ڕۆژە خۆشانەی لەیاد بردم کە لەو ماوەیەدا بەسەرم دەبرد! دوای تەواو بونی مۆڵەتەکەم



گەڕامەوە بۆ دەزگاکەم بەمەبەستی وەرگرتنی ڕێنمایی تازە بۆ ئەرکەکەم. کاتێک چوومە ژوورەوە لەلایەن بەرپرسەکەمەوە بە گەرمی پێشوازیم لێ کرا و لەباوەشی گرتم و بەخێر هاتنی کردم. منیش بەهەمان شێوە هەستم بە ئارامی کرد و دڵخۆش بووم بە سڵاو و پێشوازی بەرپرسەکەم.

بەرپرسەکەم پێی ڕاگەیاندم کە بەرپرسی دەزگاکە فەرمانی پێ کردووە و وتویەتی بە ئاگاداری ئەو لیژنەیەی کە بەر پرسە لە کاروباری ناوچەکە، بە پێویستیان زانیوە دوو نهێنی گرنگ بدەین بە تۆ، بۆ ئەوەی لە داهاتودا سودی لێ وەر بگریت. ئەوەشی پێ ڕاگەیاندم کە ئەو جۆرە نهێنیانە کەمینەیەک لە دەزگاکە لێی ئاگادارن، بۆیە پێویستە بە ئاگاوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

دوای ئەو قسانە بەرپرسەکەم دەستی گرتم و بردمیە یەکێک لەژوورەکانی دەزگاکە. لەوێ هەندێک شتم بینی تەواو توشی سەر سوڕمان و شۆکی کردم! لەو ژوورە مێزێکی گەورەی بازنەیی (خڕ) دانرا بوو، هەروەها دە پیاو دانیشتبوون یەکێکیان بە جلوبەرگی (سوڵتانی عوسمانی) و بەباشی (تورکی و ئینگلیزی) دەزانی. دووەمیان جلوبەرگی وەک جلوبەرگی ئەو شێخە بوو کە لە (ئاستانا) فەرمان ڕەوایە. سێیەمیان جلوبەرگەکەی هاوشێوەی (شا)ی فارس بوو. چوارەمیان جلەکەی وەک پیاوانی (شیعە) مەزهەب بوو. پێنجەمیان جلەکەی وەک جلی پیاوانی (شیعە) مەزهەب بوو لە نەجەف. ئەم سێ کەسەی دوایی بەباشی



هەردوو زمانی (فارسی و ئینگلیزی) یان دەزانی. هەروەها هەر یەکێک لەم پێنج کەسە نوسەرێکی لەگەڵدا بوو هەرچیەکی دەووت نوسەرەکە دەینووسی! لەهەمان کاتدا کاری ئەم نوسەرانە ڕادەست کردنی ئەو زانیاریانە بوو کە لە لایەن ئێمەوە دەنێردرا بۆ دەزگاکە. واتە ئەوانەی کاری سیخوڕیان دەکرد لە (ئاستانە و فارس و نەجەف).

لەو میانەدا بەرپرسەکەم هەندێک زانیاری و نهێنی بۆ درکاندم و وتی: ئەم پێنج کەسەمان کە لەم ژورە داناوە ئەتوانم بڵێم کۆپیەکی ئەو کەسایەتیانەیە کە لەو ناوچەیە فەرمان ڕەوان و دەسەڵاتیان هەیە. هەروەها باسی لەوەش کرد و ووتی ئەو زانیاریانەی کە بەدەست ئێمە دەگات لەلایەن ئێوەوە. واتە لە ئاستانە و تاران و نەجەف لێرەو لە لایەن ئەم پێنج کەسەوە تاوتوێ دەکرێت. تەواو وەک ئەوەی فەرمان ڕەواکانی ئەو وڵاتانە لێرەبن لەڕێگەی ئەو قسە و باسایانەی لە نێوانیان دروست دەبێت بە پاڵپشتی ئەو زانیاریانەی کە لە لایەن ئێوەوە بەدەستمان دەگات توانیومانە خوێندنەوەیەکی باش بۆ کەسایەتی و هەڵسوکەوتی ئەو

فەرمان ڕەوایانە بکەین و بزانین چۆن بیر دەکەنەوە، خۆشبەختانە هەتاکو ئێستا ٧٠٪ ی ئەنجامەکان ئەرێنی بووە و سەرکەوتوانە جێبەجێ کراوە. بەرپرسەکەم پێشنیارێکی کردوو پێی وتم پێم باشە لەگەڵ یەکێک لەم پێنج کەسە قسە بکەیت و بزانە چۆن وەڵامت دەداتەوە، منیش ئەوە زانایەم هەڵبژارد کە لە نەجەف قسەم لەگەڵدا دەکرد و باسی هەندێک بابەتی ئاینی و مەزهەبیمان دەکرد. مەبەستم لێرە ئەو زانایە بوو کە لەبری ئەو زانایە دانرابوو کەلەنەجەف دادەنیشێت و دەمویست بزانم تا چ ئاستێک هاوشێوەی پیاوە ئاینیە ڕاستەقینەکەیە! کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ پیاوە ئاینیە(ئەکتەرەکە) پێم وت: جەنابی مامۆستا ئایا ڕێگەپێدراوە ئێمەی شیعە دژی ئەو حاکمە یاخود حکومەتە سوننیە بوەستینەوە، لەبەر ئەوەی حکومەتێکی دەمار گیرە؟

کەمێک ڕاماو وتی: نەخێر نابێت دژیان بین لەبەر ئەوەی سونەن، لەبەر ئەوەی مسوڵمانان هەموویان برای یەکترن، بەڵام دەتوانین ڕێگای تر بەکار بهێنین، هەتا ئەوکاتەی دەگەنە ئەو باوەڕەی وازمان لێ دەهێنن و ڕزگارمان دەبێت لە چەوسانەوە.

پرسیارێکی ترم لێ کرد و وتم: مامۆستا بۆچوونی جەنابت سەبارەت بە (جووەکان) و (مەسیحیەکان) چیە، ئایا ئەوانیش نەفرەت لێکراو و پیسن؟ لە وەڵامدا وتی بەڵێ پێویستە دوور بکەوینەوە لێیان؛ پێم وت: بۆچی؟ وتی: لەبەر ئەوەی ئەوانیش هەمان بۆچونیان هەیە لەسەر ئێمە و بە هەمان شێوە ئێمە بە کافر دەبینن و دەڵێن پێغەمبەرەکەشتان واتە محەمەد درۆزنە، بۆیە دەبێت ئێمەش بە هەمان شێوە وەڵامیان بدەینەوە. پرسیارێکی ترم لێ کرد و پێم وت: جەنابی مامۆستا ئایا وەک دەوترێت (پاک و خاوێنی لە باوەڕداریەوەیە) ئەی بۆچی ئەو هەموو پیس و پۆخڵی و ناشرینیە لە مەزارگە پیرۆزەکەدایە، نەک هەر ئەوەش بەڵکو لەشەقام و کۆڵان و تەنانەت لە ناوەندە زانستی و فەرهەنگیەکانیش خۆڵ و خاشاکێکی زۆر بەدی دەکرێت؟!

وتی: بەڵێ هیچ گومان لەوەدا نیە کە پاک و خاوێنی لە باوەڕەوەیە، بەڵام دەسەڵات چیە لەبەرامبەر کەمی ئاو و گوێ نەدانی دەسەڵات بەپاک و خاوێنی! وەڵامەکانی نوقمی سەرسوڕمانی کردم، چونکە تەواو وەک ئەو وەڵامانە بوو کە پیاوە ئاینییە

(ڕاستقینەکە) وەڵامی دامەوە ئەو کاتەی کە لەنەجەف بووم! تەنها دوا وەڵام نەبێت. واتە ئەو وەڵامەی کە باسی لە (گوێ نەدانی حکومەت بوو بە پاک و خاوێنی) پیاوە ئاینیەکەی نەجەف باسی لەم خاڵەیان نەکرد. بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە (ئەکتەرەکە) سەرکەوتوو نەبووە لەکارەکەی. بەڵکو وەڵامەکانی ئەوەندە نزیک بوو کە توشی سەرسوڕمانی کرم. ئەمە سەرەڕای ئەوەی زمانی فارسی ئەکتەرەکە ئەوەندە پاراو بوو. هەستم ئەکرد لەگەڵ ئەو پیاوە ئاینیە قسە دەکەم کە لە نەجەف دواندبووم! بەرپرسەکەم پێی وتم: دڵنیام ئەگەر ئەو چوار فەرمانڕەوایەی دیکەت ببینیایە هەمان بۆچوونت دەبوو لەسەر ئەم چوار ئەکتەرەی کە لێرە ڕۆڵی فەرمانڕەوا ڕاستیەکان دەگێڕن! وتم بەڵێ دەزانم ئەو شێخەی ئاستانا چۆن بیر دەکاتەوە لەبەر ئەوەی شێخ ئەحمەد بە وردی هەندێک زانیاری لەسەر شێخی (ئاستانا) پێ دام: بەرپرسەکەم وتی: فەرموو لەگەڵ ئەمیشدا قسەبکە. پرسیاری ئەوەم لێ کرد وتم: قوربان ئایا جائیزە ملکەچی تەواوی خەلیفە بین؟

وتی: بەڵێ کوڕم دەبێت ملکەچی بین، هەروەک چۆن ملکەچی خودا و پێغەمبەر دەبین.
وتم: بەچی بەڵگەیەک؟!
وتی: ئەی خوای گەورە دەفەرموێ {أطيعوا الله و أطيعوا الرسول و أولي الأمر منكم}.
پرسیاری ئەوەم لێ کرد بۆچونت چیە لەسەر یەزید مەبەستم ئەو یەزیدەیە کە (حسێن)ی نەوەی پێغەمبەری کوشت؟ هەروەها پرسیاری ئەوەم لێ کرد چۆن دەبێت گوێڕایەڵی وەلید بین، ئەو وەلیدەی کە (مەی) دەخواتەوە؟
لەوەڵامدا پێی وتم: کوڕم یەزید میری مسوڵمانان بوو. هەروەها دانی بە هەڵەی خۆیدانا و پەشیمان بوو لەو تاوانەی دەرهەق بە (حسێن)ی کرد لەپای ئەوەش تۆبەی کرد: سەبارەت بە وەلید وتی: بەڵێ مەی دەخواردەوە بەڵام ئاوی لەگەڵ تێکەڵ دەکرد. ئەوە ڕێگە پێدراوە لە شەرعدا! وەک پێشتر باسم کرد هەمان پرسیارم لە شێخ ئەحمەد کردبوو ئەتوانم بڵێم جیاوازیەکی زۆرم بەدی نەکرد لە نێوان شێخ ئەحمەدە ئەسڵیەکە و ئەم شێخەی کە ڕۆڵی ئەوی ئەگێڕا.
دوای ئەوەپرسیارم لە بەرپرسەکەم کردو پێم وت ...ئەتوانم بزانم سودی

ئـەم نواندنـە چیـە ؟
وتی:ئـەم جۆرەکارانـە بـۆ دەزگاکەمـان گرنگـی زۆری هەیـە لەڕێگـەی ئـەم (ئەکتەرانـە)وە دەتوانیـن بزانیـن دەسـەڵاتداری ناوچەکـە و زاناکانیـان و پیاوانـی ئاینـی چـۆن بیردەکەنـەوە. ئیـدی شـیعەبن یاخـود سـونی.
هەروەهـا چارەسـەری گونجـاو دەدۆزینـەوە لەکاتـی بوونـی هـەر کێشـەیەک ئیـدی سیاسـی بێـت یـان ئاینـی. بۆنمونـە ئەگـەر زانیـاری وردت لەبـارەی دوژمنەکەتـەوە زانـی بەئاسـانی دەتوانیـت زاڵبیـت بەسـەریدا. ئەگـەر بزانیـت دوژمنەکـەت دەیەوێـت لـەلای ڕاسـتەوە هێـرش بکاتـە سـەرت. تـۆ خـۆت ئامـادە دەکەیـت بـۆ گشـت ئەگـەرەکان بـەلام ئەگـەر زانیاریـت نەبێـت ئـەوا سـەربازەکانت پـەرش و بـڵاو دەبـن و سـەریان لـێ دەشـێوێت و بەشـێوەیەکی قـورس لـە جەنگەکـە شکسـت دەخۆیـت. بۆیـە ئەگـەر توانیـت بچیتـە ناخـی هـەر مسـوڵمانێک ئیـدی شـیعەبێت یـان سـونی ئـەوە دەتوانیـت هەمـوو جومگەکانـی کۆنتـرۆڵ بکەیـت و کێشـمە کێشـێکی زۆریـان بـۆ دروسـت بکەیـت! لەهەمـان کاتـدا بیـر و باوەڕیـان سسـت دەبێـت.
پاشـان بەرپرسـی دەزگاکـە کتێبێکـی گـەورەی تەسـلیم کـردم و وتـی ئـەم

کتێبەکەم جارێکی تر بەوردی و بەشێوەیەکی قوڵتر لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندەوە، کۆمەڵێک بابەتی هەستیارم لەلاگەڵاڵە بوو توانیم زیاتر بچمە ناو شێوازی بیرکردنەوەی مسوڵمان، ئەو هۆکارانەشم بۆ دەرکەوت کە بووەتە هۆی دواکەوتنیان، هەروەها خاڵی لاواز و خاڵی هێزیانم بۆ دەرکەوت، ئەوەی گرنگ بوو لای من لاوازکردنی ئەو خاڵە بەهێزانەیە کە لەلای مسوڵمانان هەیە و دەبێت لەناویان بەرین.

کتێبە بخوێنەرەوە. وتم باسی چی دەکات؟ وتی ئەم کتێبە لە هەزار لاپەڕە پێک هاتووە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە پێکهاتووە لەو قسە و وتووێژانەی کە لەنێوان ئەو پێنج (ئەکتەرەدا) ڕوویداوە بەراوردێکی وردە لەگەڵ ئەکتەرە ڕاستەقینەکان. ئەو بابەتانەی کە لەم کتێبەدا بەدی دەکرێت خۆی لە کاروباری سەربازی و دارایی و ڕۆشنبیری و ئاینی دەبینێتەوە. کتێبەکەم لێ وەرگرت لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ ماڵەوە. لەو ماوەیەی کە لە ماڵەوە بووم کتێبەکەم خوێندەوە. سەرەڕای ئەوەی کە مۆڵەتیش بووم بەڵام لەبەر گرنگی کتیبەکە هەوڵم دا و هەموویم خوێندەوە. هۆیەکی تریش بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە ئەوە بوو بەرپرسەکەم ووتی دوای خوێندنەوەی کتێبەکە ڕاستەوخۆ بیگەڕێنەوە بۆ دەزگاکە.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو ئەو وتووێژ و قسەو باسانەی کە لەو کتێبەدا نوسرابونەوە دەتوانم بڵێم ٧٠٪ی وەک ئەو وێنەیە دەهاتە پێش چاوم کە خۆم لەو ناوچەیە بەدیم کردوە. واتە بەجۆرێک بوو هەستت دەکرد فەرمانڕەوا و پیاوە ئاینیە ڕاستەقینەکان پێکەوە دانیشتون و نوسیویانەتەوە! لەمەوە دڵنیا بووم کە حکومەتەکەمان و دەزگاکەمان هەتا چەند سەرکەوتووە لەکارەکانیدا و هیچ گومانم نەبوو کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەرەو داڕمان و پوکانەوە دەچێت. لەکتێبەکەش باس کرابوو بەرپرسەکەم زانیاریەکی تری بۆ ئاشکرا کردم و وتی جگە لەو ژورەی کە تۆ بینیت بەهەمان شێوە چەند ژورێکی ترمان هەیە کە هاوشێوەی ئەو ژوورەیە هەر ژوورەو تایبەتە بەناوچەیەک و وڵاتێک. ئیدی ئەو وڵاتە لەژێر هەژموونی خۆمان بێت یاخود نا.

پرسیاری ئەوەم لە بەرپرسەکەم کرد ئایا چۆن دەتوانن ئەو کەسانە هەڵبژێرن کە دەتوانن بەو ڕۆڵە هەستن و سەرکەوتوانە کارەکانیان ڕاپەڕێنن؟

وتی: هەموو ئەو باوەڕ پێکراوانەی کە کارمان بۆ دەکەن بەشێوەیەکی ورد مەشقیان پێ کراوەو بەبەردەوامی زانیاریمان بۆ دەنێرن و تایبەتمەندن لەو بوارەدا. بۆیە ئەگەر تۆش ئەو زانیاریانەت دەست بکەوێت و بتوانیت بەشێوەیەکی باش خوێندنەوە و شیکاری بۆ بکەیت ئەوا دەتوانم بڵێم ئەو کات تۆش تەواو (هەڵسوکەوت

و خـــوی) کەســـە ڕاســـتقینەکەت بـــۆ دەردەکەوێـــت.

بەرپرســـەکەم ئەوەشـــی پـــێ وتـــم کـــە بەرپرســـی دەزگاکـــە پێـــی وتـــووم ئـــەم نهێنیـــە لـــەلات بدرکێنـــم! هەروەهـــا پێـــی وتـــم ئەگـــەر زانیمـــان بەباشـــی لـــەم کتێبـــە تێگەیشـــتوویت ئـــەوا دوای مانگێکـــی تـــر نهێنیەکـــی تـــرت بـــۆ ئاشـــکرا دەکـــەم. مەبەســـت لـــە کتێبەکـــە ئـــەو کتێبـــە هـــەزار لاپەڕەییـــە بـــوو کـــە پێشـــتر لێـــم وەرگرتبـــوو.

کتێبەکـــەم جارێکـــی تـــر بـــەوردی و بەشـــێوەیەکی قوڵتـــر لـــە بەرگـــەوە بـــۆ بـــەرگ خوێنـــدەوە. کۆمەڵێـــک بابەتـــی هەســـتیارم لـــەلا گەڵاڵـــە بـــوو توانیـــم زیاتـــر بچمـــە نـــاو شـــێوازی بیرکردنـــەوەی مســـوڵمامان. ئـــەو هۆکارانەشـــم بـــۆ دەرکـــەوت کـــە بووەتـــە هـــۆی دواکەوتنیان. هەروەهـــا خاڵـــی لاواز و خاڵـــی هێزیانـــم بـــۆ دەرکـــەوت. ئـــەوەی گرنـــگ بـــوو لای مـــن لاوازکردنـــی ئـــەو خاڵـــە بەهێزانەیـــە کـــە لـــەلای مســـوڵمانان هەیـــە و دەبێـــت لەناویـــان بەریـــن.

گرنگتریـــن ئـــەو خاڵـــە لاوازانـــە بەپێـــی ڕاپۆرتـــی بەریتانیـــا:

١. کێشـــمە کێشـــی نێـــوان (شـــیعە وســـوننە) دەســـەڵات داران و گـــەل. کێشـــەی نێـــوان هـــەردوو دەســـەڵاتی تورک و فـــارس. دووبەرەکـــی نێـــوان هـــۆزەکان. کێشـــەی نێـــوان زانـــاکان و دەســـەڵات داران.

٢. دواکەوتـــووی و گەندەڵـــی و نەخوێنـــدەواری بەشـــێوەیەک بـــڵاو بووەتـــەوە خەریکـــە هەمـــوو مســـوڵمانان دەگرێتـــەوە. ئەتوانیـــن بڵێیـــن کەمینەیەک مـــاوە کـــە بەشـــێوەیەکی لۆژیکیانـــە بیـــر دەکەنـــەوە.

٣. بـــێ هیوایـــی و نەمانـــی وشـــیاری و لەدەســـتدانی هەســـت و هـــۆش.

٤. گـــوێ نـــەدان بـــە ژیانـــی ڕۆژانـــە و گرنگـــی دان بـــە ڕۆژی دوایـــی و کارکـــردن تەنهـــا لـــەو بارەیـــەوە.

٥. دیکتاتـــۆری و چەوســـانەوە لەلایـــەن دەســـەڵات.

٦. نەبوونـــی ئاســـایش و بچڕانـــی هۆیەکانـــی گواســـتنەوە.

٧. بـــڵاو بونـــەوەی نەخۆشـــی بەشـــێوەیەکی بـــەر بـــڵاو بەجۆرێکـــە خەڵکـــی هەراســـان کـــردووە و ژیانیـــان لـــێ تـــاڵ بـــووە.

٨. وێـــران بوونـــی وڵات و دیـــاردەی بەبیابـــان بـــوون و وشـــک بوونـــی ڕوبـــارەکان و دواکەوتنـــی کەرتـــی کشـــتوکاڵ.

٩. بـــڵاو بونـــەوەی پشـــێوی و گەدەڵی هەمـــوو ســـێکتەرکانی گرتۆتـــەوە. بـــەو مانایـــەی نەسیســـتم مـــاوە نـــە



باسا ماوە، هەرچەندە قورئان و فەرموودەکانیان لەلا پیرۆزە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک پابەند نین پێوەی!

١٠. دارمانی ئابوریان بەشێوەیەکە زۆربەی دانیشتوان بەدەست فەقیری و بێ کاریەوە دەناڵێنن.

١١. نەبوونی سوپایەکی نیشتیمانی و نەبوونی چەکی پێویست و جبەخانە یەکێکی ترە لەو کێشانەی بەدەستیەوە دەناڵێنن.

١٢. پێشێل کردنی مافی ژنان و سوکایەتی پێ کردنیان.

١٣. شەقام و بازاڕ و گەڕەکەکان بەشێوەیەک پیسە مرۆڤ قێزی لێ دەکاتەوە.

(قورئان سەبارەت بە خاڵە لاوازەکان هۆشداری داوە)

لەکتێبەکەدا چەندین بابەتی تێدایە باسی هەندێک باسا دەکات لە ئیسلامدا کاری لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئەرێنی کاریگەری دروست بکات لەسەر مسوڵمانان. بەو مانایەی کەکار بکاتە سەر ئاستی بیرکردنەوە و هۆشیارییان. بۆ نمونە کتێبەکە باس لەم چەند خاڵەی خوارەوە دەکات کەدەتوانین سودی لێ وەربگرین:-

١. فەرمان دەکات بۆ بەدەست هێنانی زانست و زانیاری (طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة).

٢. فەرمان دەکات وشیار بن وەک لە قورئاندا هاتووە (فسيروا في الأرض).

٣. فەرمان دەکات یەکگرتووبن و دوور بکەونەوە لە دوو بەرەکی (واعتصموا بحبل الله جميعاً).

٤. فەرمان دەکات بۆ ئەوەی داواکاریيان هەبێت لە ژیاندا، وەک لەقورئاندا هاتووە (ومنهم من يقول ربنا آتينا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة).

٥. فەرمـان دەكات ڕاوێـژ لەگـەڵ یەكتـر بكـەن وەک لـە قورئانـدا هاتـووە (وأمرهم شـوری بینهـم).

٦. فەرمـان دەكات ئـاگاداری تەندروسـتیان بـن وەک لـە فەرموودەیەكـدا هاتـووە (چـوار زانسـتی سـەرەكی هەیە زانسـتی یاسـا ئاینیـەكان بـۆ پارێـزگاری لـە ئایـن، زانسـتی پزیشـكی بـۆ تەندروسـتیەكی بـاش، زانسـتی زمانەوانـی بـۆ زمانێكـی پـاراو، زانسـتی فەلـەک ناسـی بـۆ زانیـاری لەسـەر گـەردون.

٧. فەرمـان دەكات بـۆ بوژانـەوە و ئاوەدانـی وەک لـە قورئانـدا هاتـووە (وخلـق لكـم مـا فـي الأرض جمیعـآ).

٨. فەرمـان دەكات بـۆ هاوسـەنگی و نەخشـە دانـان وەک لـە قورئانـدا هاتـووە (مـن كل شـيء مـوزون) هەروەهـا لەفەرموودەیەكـدا هاتـووە (ونظـم أمركـم)

٩. فەرمانیـان پـێ دەكات ئابوریەكـی بەهێزیـان هەبێـت، وەک پێغەمبـەر دەفەرموێـت (مـن لا معـاش لـە معادلـة).

١٠. فەرمـان دەكات سـوپایەكی بەهێـز و پـڕ چەكیـان هەبێـت، وەک لـە قورئانـدا هاتـووە (وأعـدوا لهـم مـا اسـتطعتم مـن قـوة).

١١. فەرمانیـان پـێ دەكات ڕێـز لـە خانمـان بگـرن وەک لەقورئانـدا هاتـووە (ولهـن مثـل الـذي علیهـن بالمعـروف).

١٢. فەرمـان دەكات پـاک و خاوێـن بـن. لەفەرمودەیەكـدا هاتـووە دەڵـێ (النظافة مـن الإمـان).



ئاوات کۆکەیی

# مەترسییەکانی ئازادیی کەسی سەربازی لە سۆشیال میدیادا

لە جیهانی نوێدا بەکارهێنانی سۆشیال میدیا بۆتە بەشێک لە ژیانی هەنووکەیی هەر تاکێکی کۆمەڵگە. مەگەر تاک و زۆر بە دەگمەن کەسێک هەبێت تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکار نەهێنێت. دەنا تەواوی خەڵک لە هەر چوار قوڕنەی جیهانەوە میدیایەک لە گیرفانیدا هەیە.
بەکارهێنانی ئەو میدیایەش هێندە بێ سانسۆر و ئازادە کەسانی نەخوێندەواریش دەنووسن و لێدوان دەدەن و پەخشی بۆچوونەکانی خۆیانی تێدا دەکەن. لە زۆر حاڵەتیشدا کەسی بەکارهێنەر خاوەنی هیچ پەیام و بۆچوونێکی لۆژیکی نییە. ئەوەی دەیکات و دەیڵێت هەڵڕشتنی هەستی پەنگخواردووی ناخی خۆیەتی و چاولێکەریانە بەناو کەوتووە. دواجاریش ئەم ڕەوشەی لێکەوتۆتەوە کە دیوە خراپەکەی زاڵکردووە بەسەر دیوە باشەکەدا و بگرە شاردووشییەتیەوە. کاریگەریی سۆشیال میدیا هێندە بە قووڵی ڕۆچۆتە ناو ژیانی گشتییەوە، خەڵکی تاقەتی چاودێریکردن و سەیرکردنی پرۆگرامێکی سەنگین و شایستەی نییە لە کەناڵێکی بەرپرس و خاوەن پەیامی میدیاییەوە. لە ڕاستیشدا دامەزراوە میدیاییە خاوەن پەیامەکان نەک نەیانتوانییوە پارێزگاریی لە هەژموون و ڕێژەی بینەر و بیسەر و خوێنەرانی خۆیان بکەن، بگرە زۆرێکیشان کەوتونەتە ژێر کاریگەریی

پڕ بینەریی کەناڵەکانی سۆشیال میدیاو لە راستەڕێ لایانداوە. ئەمە دەردێکی کوشندەیە و ئەگەر چارەسەر نەکرێت. ئایندەی لەمەش خراپترمان تووش دەبێت.

ئەمەی باسمکرد رەوشێکی گشتییە و خەریکە باسکردنیشی دەبێتە دووبارەو چەندبارە و شتێکی سواو. ئەوەی باسیش کراوە نەبۆتە هۆی راستکردنەوەی بارە خوارەکە و بگرە خەریکە بەتەواوەتیش دەگلێت. چونکە کۆنترۆڵکردنی هەر تاکێک لەم رەوشی تەشەنەسەندووەی سۆشیال میدیادا. کارێکی نەکردەییە. لانیکەم لە ئێستادا.

بۆیە واز لەوە دەهێنم و لە بارەی کەسانی ناو کایە سەربازی و چەکدارییەکەوە دەدوێم کە ئەوانیش هاوتای چین و توێژەکانی دیکە و بە هەمان ئازادیی بێسنوورەوە. سۆشیال میدیا بەکار دەهێنن.

سەرباز لە سادەترین پێناسەیدا ئەو کەسەیە کە خۆی بەختدەکات لەپێناو گەل و نیشتماندا و لە پێناو ئەرکەکەیدا دەربەستی ژیان و مەرگی خۆی نایەت. سەرباز لای خەڵک خاوەن غیرەت و بوێری و شکۆی بەرزە. ئەو هێزە تا چەند خاوەن دیسپلین و

**سلکی سەربازی:**

**ئەم سلکە، بەهۆی گرنگی و هەستیاری ئەرکەکەی، هەمیشە چاوی دۆست و دوژمنی لەسەرە، جا بۆ پاراستنی هەیبەت و قورسایی خۆیان، کەسی سەربازی و بەتایبەتیش ئەفسەر دەبێ خۆی لە زیاد پیشاندان و زیاد قسەکردن و هەڵسوکەوتی لابەلا بپارێزێت.**



هەڵسوکەوتی سەربازییانەی خۆی بێت و پەیام و بیروباوەڕەکانی لە شێوەو ڕەفتاریدا ڕەنگ بداتەوە، هێندەش ئاسایشی ناوخۆی وڵات و سنوورەکان بەهێزتر دەبن و دەرفەتی بیرکردنەوەی هێرش و داگیرکاری لەلایەن دوژمنانەوە، بەرتەسکتر دەبێتەوە.

ئەگەر روونتر بدوێین، ئەفسەر (ضابط) کە ئاوێنەی هێز- لەشکرە و بە وردبوونەوە لێی ئاستی هێزەکە دەردەکەوێت، تا زیاتر خاوەن کەسێتی فەرماندەرانە و بە بیروباوەڕ و خاوەن قیافە و چوست و چالاک بێت، ئەوەندە نمایشی هێزێکی ئامادە و خۆبەختکار دەکات.

ئەفسەر کە بە عەرەبی پێی دەوترێت ضابط، وەک تەعبیرە کوردێندراوەکە، بە مانای (زەبت و ڕەبت) دێت، واتای روونتر: تۆکمەیی، ڕێکوپێکی و خاوەن دیسپلین دێت.

ئەم سلکە، بەهۆی گرنگی و هەستیاری ئەرکەکەی، هەمیشە چاوی دۆست و دوژمنی لەسەرە، جا بۆ پاراستنی هەیبەت و قورسایی خۆیان، کەسی سەربازی و بەتایبەتیش ئەفسەر دەبێ خۆی لە زیاد پیشاندان و زیاد قسەکردن و هەڵسوکەوتی لابەلا بپارێزێت.

ئێستا هەژموونی سۆشیال میدیا کە زۆر قیەم و بنەمای تێکشاندووە، کەم تا زۆر خەریکە ئەم توێژەش بەو دەردە دەبات، ناڵێم بۆتە دیاردە و ناشڵێم زۆر، بەڵام بەشی ئەوەندە سەربازو ئەفسەرمان هەیە کە دیمەنێکی نەگونجاو بدەن بە دامەزراوەی هێزی سەربازیمان، خۆ ئەگەر چەند کەم

و دەگمەنیش بن. هەر دەبێت وەک خاڵێکی نەگەتیف سەیری بکەین.

ئەگەر تۆزێک بە دیقەتەوە سەیری لاپەڕەکانی هەندێک ئەفسەر بکەین لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک. دەبینین بە بەرگێکی سەربازی پڕ کەموکووڕییەوە کە قیافەیەکی نارێک و پەڕپوتی پێبەخشیوە. وێنەیەکی داناوە و دەڵێت: لە سەردانێکم بۆ فلان شوێن و بۆ لای فلان بەرپرس.

کە دەڵێم بەرگێکی پڕ کەم و کووڕی. بەواتای جلوبەرگێکی بێ ئوتوو. بەبێ قۆردوون (حەبلی لای راست). نیشانەی سەرشانەکانی خوارو لار و بێ تەنسیق. جوتێک قۆندەرەی ئاسایی -مەدەنی و هی تریش.

بوونی ئەم کەموکووڕییانەش لە شکۆو کەسێتی ئەفسەر کەم دەکاتەوە و وەک جۆرێکیش لە گاڵتەجاڕ دێتە پێش چاو.

هەندێک ئەفسەر هەیە بە بۆنەو بێ بۆنە وێنەی خۆیان بە جل و بەرگی ئەفسەرییەوە لەسەر لاپەڕەی فەیسبووک دادەنێن. یان هەمان وێنە لەگەڵ بابەتێکی شەق و شڕی پڕ لە هەڵەی ئیملایی و زمانەوانی و بێ ناوەرۆک دادەنێن. یان بە شێوەیەکی خواروولار راوەستاوەو تا هێزیشی تیایە پێکەنیوە.

یاخود چەند کەسێک وێنەیەکیان لە فەیسبووک داناوە هەر یەکەیان جۆرێک جلوبەرگی لەبەردایە. رەنگاو رەنگ و خواروخێچ. تیایاندا هەیە قۆندەرەی رەشی لە پێدایە. هەیە کالەی سپی و هەشە بە نەعلەوە. کاتێک ئەو دیمەنانە بڵاودەبنەوە. راستەوخۆ پرسیار لە سەر دامەزراوەی سەربازی درووست دەبێت و لە هەیبەت و ناوبانگی دەدرێت. بۆیە ئەم حاڵەتە پێویستی بە لێ پێچینەوە و بەرگرتن هەیە.

بۆیە قسەی کۆتاییم ئەوەیە پێویستە بابەتی خراپ بەکارهێنانی سۆشیال میدیاش بخرێتە چوارچێوەی ئەو هەڵمەتی چاکسازی و رێخستنەوەیەی کە لەناو هێزی پێشمەرگەدا دەستی پێکردووە و بکرێتە یەکێک لە خاڵە سەرەکییەکان.

# نامرن ئەوانەی وا لە دڵی میللەتدا دەژین

# گۆشەی

ئامادەکردنی: بەشی شەهید

نامرن ئەوانەی والەدڵی میللەتدا دەژین

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەو حزبەی لەسەرەتای دامەزراندنییەوە تائێستا زیاترلە(18)هەزارشەهیدی پێشکەش بەگەلی کورد کردووە هەرئەوەشەکە یەکێتی نازناوی حزبی شەهیدانی پێ بەخشراوە،بستە خاکێکی نیشتیمان نابینی بەخوێنی ڕۆڵەیەکی یەکێتی سوور نەبووبێت،مێژووی ئەم حزبە تێکۆشەرە هەرلەسەرەتای دروست بوونییەوە تائێستا بەچەند قۆناغێکی سەخت ودژواردا تێپەڕیووە و مێژووەکەشی لێوان لێوە لە سەروەریی گەورە و گران بەها(ی.ن.ک) بەدرێژایی خەباتی چەکداری شاخ و شاردەیان داستان و قارەمانێتی بۆ میللەتەکەی تۆمار کردووە لەپێناو بەدەست هێنانی ئازادی و پاراستنی مافی مرۆڤ و بەدیهێنانی مافی چارەی خۆنوسین و ئەزموونی حوکمڕانی کوردستان نزیك لەیەك چارەکە سەدە خەبات و بەردەوامی شاهیدی ئەوڕاستیەن ولەوپێناوەشدا دەیان سەرکردە و سەدان فەرماندە و هەزاران پێشمەرگەی بەئەمەك لەدژی شەڕەنگێزی داگیرکەران و هێرش و پەلاماری تیرۆرستان لەسەنگەری بەرگریدا شەهید بوون و بەخوێنی گەشیان ئەم ئازادیەی ئەمڕۆیان دروست کرد. (گۆشەی نەمران لەگۆڤاری "ڕێبەر") تایبەتە بەشەهیدان هەوڵ دەدەین لەگەڵ دەرچوونی هەرژمارەیەك ژیان نامەی چەند شەهیدێك بخەینە بەردیدەی هاوڕێ و هاوسەنگەر و خوێنەرانی بەڕێز.

لەگەڵ ڕێزدا.

# نەمران

ڕێکخستنی پێشمەرگە



شەهید(پشتیوان رحمان نریمان)

لە ساڵی26/2/1988 لە قەزای چەم چەماڵ لە دایک بووە بروانامەی 3 ناوەندی بەدەستهێناوە لە ساڵی 29/1/2008 بووە بە پێشمەرگە لە فەوجی تایبەتی دژەتیرۆر لە ساڵی 2008 ژیانی هاوسەرێتی پێک هێناوە خاوەنی 2 منداڵە بە ناوەکانی لاڤە و تۆلاس ،لە بەرواری 11/6/2015 لە شاری کەرکوک شەهید بووە.....



شەهید(مولود علی محمد عزیز)

ناسراوە بە مولود علی شاکەیی لە ساڵی 1982 لەگوندی شاکەل لەدایک بووە خوێندنی سەرەتای هەرلەو گوندە تەواو کردووە دواتر بەهۆی هەژاری و کەم دەرامیتیەوە دەستی لە خوێندن هەڵ گرتووە،لەساڵی2008 ژیانی هاوسەرێتی پێک هێناوە خاوەنی 2 منداڵە بە ناوەکانی ئارام-اسما لەساڵی2005 بووە بە پێشمەرگە لە فەوجی تایبەتی دژەتیرۆر لە بەرواری 24/7/2014 لە ناحیەی جەلەولا شەهید بووە....



شەهید(رزگار عبوش صابر)

لەساڵی30/5/1985 لە کەرکوک لە دایک بووە لە ساڵی 16/4/2006 بووە بە پێشمەرگە لە فەوجی تایبەتی دژەتیرۆر لە ساڵی 2005 ژیانی هاوسەرێتی پێک هیناوە خاوەنی 2 منداڵە بە ناوەکانی محمد و هێلین ،لەبەرواری 24/5/2013 لە کەرکوک شەهید بووە......



شەهید(عریف/علی غازی رووف نجم الطالبانی)

لەساڵی 1998 لەگەرەکی دەروازەی شاری کرکوک لە دایک بووە،تاقۆناغی ناوەندی خوێندوە دواتر لەساڵی29/1/2008 پەیوەندی کردوە بە دەزگای دژەتیرۆر تا دواساتەکانی بەردەوام بووە لەساڵی2010 ژیانی هاوسەرێتی پێک هیناوە خاوەنی 2 منداڵە بە ناوەکانی (محمد-ئانیا) لە بەرواری 27/7/2014 لە ناحیەی جەلەولا شەهید بووە...

ڕێبەر



# NATO

# چەن زانیاریەك سەبارەت بە ڕێکخراوی ناتۆ

پەیمانی باکووری ئەتڵەسی( ناتۆ) بە ئینگلیزی: North Atlantic Treaty Organization کورتکراوەکەی بە ئینگلیزی:(( NATO)).

ناتۆ ڕێکخراوێکی سەربازی نێودەوڵەتیەو لە ساڵی ١٩٤٩ دامەزراوە. دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە لەسەر بنچینەی دامەزراندنی پەیماننامەی باکوری ئەتڵەسی بوو کەلە ڕۆژی ٤ ی نیسانی ١٩٤٩ لە واشنتۆن ئیمزای لەسەرکرا.

پەیمانی ناتۆ سیستەمێکی بەرگری بەکۆمەڵ پێکدەهێنێت کە وولاتە ئەندامەکان لەسەری ڕێککەوتون بۆ بەرگری هاوبەش لەپێناوی وەڵامدانەوەی هەر هێرشێکی دەرەکی کەبکرێتە سەر وولاتانی ئەندام.

سێ لە ئەندامەکانی ناتۆ ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتین، کەئەوانیش بریتین لە:(ئەمریکاو فەرەنساو بەریتانیا).

بارەگای سەرەکی ڕێکخراوی پەیمانی ناتۆ دەکەوێتە برۆکسلی پایتەختی بەلجیکاوە.

پەیمانی ناتۆ یان ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی، هاوپەیمانێتیەکی سەربازی نێو دەوڵەتیە کە(٣٠) وولاتی سەربەخۆ ئەندامن تیایدا لەسەراپای وولاتانی ئەمریکای باکوورو ئەوروپادا. هەروەها(٢١) وولاتی تریش ئەندامن لە

پرۆگرامی هاوپشتی لەپێناوی ئاشتیدا. کەسەر بە ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسیە.
ئەم ڕێکخراوە لەسەرەتای دروستبوونیدا بوو کە جەنگی کۆریا لە ساڵی ( ١٩٥٠ – ١٩٥٣) هەڵگیرسا. پێشهاتەکانی ئەم جەنگە گەرم و گوڕیەکی زیاتری بەخشیە ناتۆو چەندین وولاتی دیکە پەیوەندیان پێوەکردو ژمارەی ئەندامەکانی هەڵکشانێکی بەرچاوی بە خۆوە بینی. لەهەمان کاتدا کار لەسەر ئەوە کرا کە پەیکەرە سەربازیەکەی زیاتر ڕێک بخرێت و لە ژێر سەرپەرشتی دوو فەرماندەی سەربازی ئەمریکیدا پێکهاتەیەکی سەربازی پتەوی بۆ دارێژرا.
دوای ڕووخانی دیواری بەرلین لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٨٩. ڕێکخراوەکە بەشداری لە پارچەپارچەبوونی یوگسلاڤیا کرد. یەکەم دەستێوەردانی سەربازی خۆی لە بۆسنە لە ساڵی ١٩٩٢ تا ١٩٩٥ ئەنجامدا و دواتر لە ساڵی ١٩٩٩لە یوگۆسلاڤیا دەستێوەردانی ئەنجامدا. لە ڕووی سیاسیەوە ڕێکخراوەکە هەوڵیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ وولاتانی پێشووی پەیمانی وارشۆ پەرەپێبدات و بیانکاتە ئەندام لای خۆی . کە لە ماوەی ساڵانی نێوان ١٩٩٩ تا ٢٠٠٤ بەشێکی زۆری ئەندامانی پێشووی ئەو ڕێکخراوە پەیوەندیان پێوەکردو تیایدا بوونە ئەندام و بە پێی مادەی (٥) ی ڕێکخراوەکە بۆ یەکەم جار هانایان بۆ ئەو ڕێکخراوە برد.

**پەیمانی بڕۆکسل پەیمانێکی بەرگریی لەیەکتر کردن بوو لە دژی هەڕەشەی سۆڤیەت لە سەرەتای جەنگی سارددا. لە ١٧ی ئازاری ١٩٤٨ پەیماننامەکە لەلایەن بەلجیکا و هۆڵەندا و لۆکسمبۆرگ و فەرەنسا و بەریتانیا واژۆ کرا، کە ئەمەش سەرەتایەک بوو بۆدروست بوونی ڕێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتڵەستی ( ناتۆ).**

کە لەو مادەیەدا هاتوە. پێویستە لەسەر ئەندامانی ڕێکخراو بەرگری سەربازی لە هەر وولاتیکی تری ئەندام بکەن ئەگەر رووبەرووی هەر مەترسیەکی سەربازی دەرەکی بووەوە.

دوای رووداوەکانی (١١ سێپتەمبەر ٢٠٠١) ناتۆ رۆڵێکی گرنگی گێڕا لە جەنگی ئەفغانستان و دەربەڕاندنی دەسەڵاتی ڕێکخراوی تیرۆریستی تالیبان لەو وولاتە. دواتریش هاوکاری گەلانی عێراقی کرد لە رووخاندنی رژێمی دیکتاتۆری سەدام و هاوکاری بنیاتنانەوەی سوپای عێراق.

ئیتر چالاکیە دەرەکیەکانی پەیمانی ناتۆ بەردەوام لە زۆربووندابوو. لەوانە: هاوکاریکردن لە ئۆپەراسیۆنەکانی بەرەنگاربوونەوەی چەتەی دەریایی هەروەها لە ساڵی ٢٠١١ ناتۆ ناوچەی دژە فڕینی بەسەر لیبیادا سەپاند بەپێی بڕیاری ١٩٧٣ی ئەنجومەنی ئاسایش.

بەڵام مادەی (٤) ی ڕێکخراوەکە کەمترین کاری پێکراوە . کە بریتیە لە ڕاوێژکاری نێوان ئەندامان لە کاتی رووبەرووبوونەوەی مەترسی . لە کاتێکدا کە پێنج جار تورکیا ویستوبەتی لەڕێگەی ئەم مادەیەوە هاوکاری ڕێکخراوەکە بەدەس بهێنێت بەڵام بێسوود بوە.

لە سەرەتای دامەزراندنیەوە. وڵاتانی ئەندام لە ١٢ وڵاتی سەرەتاییەوە بۆ ٣٠ وڵات زیادیان کردووە. دوایین وڵاتانی ئەندام کە زیاد کران بۆ ناتۆ بریتی بوون لە مۆنتینیگرۆ لە ٥ی حوزەیرانی ٢٠١٧ و باکووری مەقدۆنیا لە ٢٧ی ئازاری ٢٠٢٠.

لە ئێستادا ناتۆ بۆسنە و هەرزەگۆڤین و جۆرجیا وەک ئەندامی ئاواتخوازی دەناسێت. لە دوای هێرشەکانی ڕوسیاش بۆ سەر ئۆکرانیا هەردوو وڵاتی سویدو فینلاند هەوڵەکانیان بۆ بوون بە ئەندام لەو ڕێکخراوە زیاتر چڕکردۆتەوە.

سەرەتاکان

پەیمانی برۆکسل پەیمانێکی بەرگری لەیەکتر کردن بوو لە دژی هەڕەشەی سۆڤیەت لە سەرەتای جەنگی سارددا. لە ١٧ی ئازاری ١٩٤٨ پەیماننامەکە لەلایەن بەلجیکا و هۆڵەندا و لۆکسمبۆرگ و فەرەنسا و بەریتانیا واژۆ کرا. کە ئەمەش سەرەتایەک بوو بۆدروست بوونی ڕێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتڵەستی ( ناتۆ).

هەڕەشەی ڕاستەوخۆی سۆڤیەت بە گەمارۆدانی بەرلین لە ساڵی ١٩٤٨ . کە بووە هۆی دروستبوونی ڕێکخراوی یەکێتی ئەوروپای رۆژئاوا لە ئەیلوولی ١٩٤٨. بەڵام لایەنەکان لە رووی سەربازیەوە زۆر لاواز بوون بۆ رووبەرووبوونەوەی دەسەڵاتی سەربازی یەکێتی سۆڤیەت. ئەمە سەرەڕای کودەتاکەی چیکۆسلۆڤاکیا لە ساڵی ١٩٤٨ لەلایەن شیوعیەکانەوە کە حکومەتی دیموکراسی رووخاند. ئێرنست بیڤین وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جەختی



لەوە کردەوە کە باشترین ڕێگە بۆ ڕێگریکردن لە کودەتایەکی دیکە بریتییە لە پەرەپێدانی ستراتیژێکی سەربازی هاوبەشی ڕۆژئاوا. ئەمریکا لەم بارەیەوە لەگەڵیدا هاوڕا بوو. بە تایبەت بە لەبەرچاوگرتنی نیگەرانییەکانی ئەمریکا سەبارەت بە ئیتالیا (و حزبی شیوعی ئیتاڵی).

لە ساڵی ١٩٤٨ سەرکردەکانی ئەوروپا لەگەڵ بەرپرسانی بەرگری و سەربازی و دیپلۆماتکاران لە پێنتاگۆن کۆبوونەوە. بە فەرمانی جۆرج سی مارشال وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، دانوستانەکان بۆ هاوپەیمانییەکی سەربازی نوێ دەستی پێ کرد .لە ئەنجامدا پەیمانی باکووری ئەتڵەسی لێکەوتەوە. کە لەلایەن هاری ترومان سەرۆکی ئەمریکاوە لە ٤ی نیسانی ١٩٤٩ لە واشنتۆن دی سی واژۆ کرا. پەیمانی پێنج لایەنەی برۆکسل چەن وولاتێکی تریشی لە خۆ گرتبوو. لەوانە : ئەمریکا، کەنەدا، پورتوگال، ئیتاڵیا، نەرویج، دانیمارک و ئایسلەندا. یەکەم سکرتێری گشتی ناتۆ، لۆرد ئیسمای، لە ساڵی ١٩٤٩دا ڕایگەیاند کە ئامانجی ڕێکخراوەکە «هێشتنەوەی رووسەکانە لە دەرەوە و ئەمریکییەکان لەناوەوە و رووخاندنی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات».

### چالاکیە سەربازییەکانی ناتۆ

ناتۆ لە سەردەمی جەنگی ساردا هیچ ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی ئەنجام نەدا. دوای کۆتاییهاتنی ئەم شەڕە، یەکەم ئۆپەراسیۆنەکان، «پاسەوانی ئەنکر Anchor Guard » لە ساڵی ١٩٩٠ و «پاسەوانی ئاس Ace Guard » لە ساڵی ١٩٩١، کە بەهۆی لەشکرکێشی عێراق



بۆ سەر کوێت ئەنجام دران.

دەستێوەردانی کۆسۆڤۆ

لە هەوڵێکدا بۆ وەستاندنی هەڵمەتی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچی سەرکردەی سربەکان دژی جوداخوازانی سوپای ڕزگاری خوازی کۆسۆڤۆو و خەڵکی مەدەنی ئەلبانی کۆسۆڤۆ. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٣ی ئەیلولی ١٩٩٨ بڕیاری ١١٩٩ی پەسەند کرد بۆ داوای ئاگربەست. دوای هەرەسهێنانی دانوستانەکان بە سەرۆکایەتی نێردەی تایبەتی ئەمریکا ڕیچارد هۆڵبروک لە ٢٣ی ئازاری ١٩٩٩ . ئیتر ئەو بابەتە ڕادەستی ناتۆ کرا بۆ چارەسەرکردنی. ئیدی ناتۆش ٢٤ی ئازاری ١٩٩٩ هەڵمەتێکی بۆردومانی ٧٨ ڕۆژەی دەستپێکرد. ئۆپەراسیۆنی هێزی هاوپەیمانان توانا سەربازییەکانی کردە ئامانج لە کۆماری فیدراڵی یوگۆسلاڤیا.

هەروەها لە ماوەی قەیرانەکەدا، ناتۆ یەکێک لە هێزەکانی وەڵامدانەوەی نێودەوڵەتی خۆی وەک هێزی ئەلبانیا جێگیر کرد بۆ گەیاندنی یارمەتییە مرۆییەکان بۆ پەنابەرانی کۆسۆڤۆ.

هەرچەندە ئەم هەڵمەتە ڕەخنەی زۆری لێگیرا بەهۆی قوربانیانی زۆری خەڵکی مەدەنی، لەنێویاندا بۆردومانی باڵیۆزخانەی چین لە بەلگراد، بەڵام دواجار میلۆسێڤیچ لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٩٩دا مەرجەکانی پلانی ئاشتی نێودەوڵەتی قبوڵ کرد و بەمەش جەنگی کۆسۆڤۆ کۆتایی هات.

## شەڕی ئەفغانستان

هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر لە ئەمریکا وایکرد کە ڕێکخراوەکە بۆ یەکەمجار لە مێژووی خۆیدا بانگەشە بۆ ماددەی پێنجەمی میساقی ناتۆ بکات. لە

بابەتەکەدا هاتووە. هێرشکردنە سەر هەر یەکێک لە ئەندامەکانی بە هێرشکردنە سەر هەمووان دادەنرێت.

لە ١٦ای نیسانی ٢٠٠٣ ناتۆ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر وەرگرتنی فەرماندەیی هێزی هاوکاری ئاسایشی نێودەوڵەتی (ISAF) کە هێزەکانی ٤٢ وڵات لەخۆدەگرێت. ئەم بڕیارە لەسەر داوای ئەڵمانیا و هۆڵەندا هات کە ئەو دوو وڵاتە لە کاتی ڕێککەوتنەکەدا سەرکردایەتی هێزی هاوکاری ئاسایشی نێودەوڵەتی (ISAF) ئیسافیان کردووە و لە لایەن هەر ١٩ باڵیۆزی ناتۆ بە کۆی دەنگ پەسەند کرا. لە ١١ی ئاب کۆنترۆڵەکە رادەستی ناتۆ کرا و ئەمە یەکەمجار بوو لە مێژووی ناتۆدا کە ڕێکخراوەکە بەرپرسیارێتی ئەرکێکی لە دەرەوەی ناوچەی باکوری ئەتڵەسی لە ئەستۆ بگرێت.

**لە 20ی ئازاری 2011، وڵاتانی سەر بە ڕێکخراوی ناتۆ ڕێککەوتن لەسەر سەپاندنی گەمارۆی چەک بەسەر لیبیادا. لە 24ی ئازاردا ناتۆ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پابەندبوون بە کۆنترۆڵکردنی ناوچەی دژە فڕین، لەکاتێکدا فەرماندەیی بەئامانجکردنی یەکە زەمینییەکان لای هێزەکانی ناتۆ مایەوە**

### نێردەی ڕاهێنەران لە عێراق

لە مانگی ئابی ٢٠٠٤ و لە کاتی جەنگی عێراقدا، ناتۆ نێردەی مەشقی (ناتۆ-عێراقی) دامەزراند. کە ئەرکی مەشق و ڕاهێنانە بۆ هاوکاریکردنی هێزە ئەمنییەکانی عێراق بە هاوکاری لەگەڵ هێزە فرەنەتەوەییەکان بە سەرۆکایەتی ئەمریکا. ئەم ئەرکی ڕاهێنانە لەسەر داوای حکومەتی کاتی عێراق بەپێی برگەکانی بریارنامەی ١٥٤٦ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزراوە. کەنداوی عەدەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی چەتەی دەریایی. لە ١٧ی ئابی ٢٠٠٩، ناتۆ

کەشتییە جەنگییەکانی بڵاوکردەوە لە ئۆپەراسیۆنێکدا بۆ پاراستنی هاتوچۆی دەریایی لە کەنداوی عەدەن و زەریای هیندی لە چەتەی دەریایی سۆماڵ، هەروەها بۆ یارمەتیدانی بەهێزکردنی هێزی دەریایی و پاسەوانی کەناراوەکانی وڵاتانی ناوچەکە. ئۆپەراسیۆنەکە لەلایەن ئەنجومەنی باکووری ئەتڵەسییەوە پەسەندکرا کە کەشتییە جەنگییەکانی بە پلەی یەکەم لە ئەمریکاوە لەخۆگرتبوو. هەروەها کەشتییەکانی زۆر وڵاتی دیکەشی لەخۆدەگرت.

## دەستێوەردان لە لیبیا

لە کاتی شەڕی ناوخۆی لیبیادا توندوتیژییەکان لە نێوان خۆپیشاندەران و حکومەتی لیبیا بە سەرۆکایەتی عەقید موعەمەر قەزافی پەرەی سەند و لە ١٧ی ئازاری ٢٠١١ بڕیارنامەی ١٩٧٣ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کە داوای ئاگربەستی کردبوو. هەروەها رێگەی بە کردەوەی سەربازی دا بۆ پاراستنی خەڵکی سڤیل. هاوپەیمانییەک لە چەندووڵاتێکی ئەندامی ناتۆدروست بوو کە دەستی کرد بە سەپاندنی ناوچەی دژە فڕین بەسەر لیبیادا.

هەروەها لە ٢٠ی ئازاری ٢٠١١، وڵاتانی سەر بە رێکخراوی ناتۆرێککەوتن لەسەر سەپاندنی گەمارۆی چەک بەسەر لیبیادا. لە ٢٤ی ئازاردا ناتۆ رەزامەندی دەربڕی لەسەر پابەندبوون بە کۆنترۆڵکردنی ناوچەی دژە فڕین. لەکاتێکدا فەرماندەیی بەئامانجکردنی یەکە زەمینییەکان لای هێزەکانی ناتۆ مایەوە. هێزەکانی ناتۆ بە فەرمی لە ٢٧ی ئازاری ٢٠١١ بە هاوکاری هێزە ئاسمانییەکانی ئیمارات و قەتەر دەستیان بە جێبەجێکردنی بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد.

لە مانگی حوزەیراندا، راپۆرتەکان لەبارەی دابەشبوون لەناو هاوپەیمانییەکە دەرکەوتن. چونکە تەنیا هەشت وڵات لە کۆی ٢٨ وڵاتی ئەندام بەشدارییان لە ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕدا کردووە. ئەمەش بووە هۆی رووبەڕووبوونەوەی نێوان رۆبەرت گەیتس وەزیری بەرگری ئەمریکا و وڵاتانی وەک پۆڵەندا، ئیسپانیا، هۆڵەندا، تورکیا و ئەڵمانیا بۆ بەشداریکردنی زیاتر. گەیتس لە دوایین وتاری سیاسیدا لە ١٠ی حوزەیران لە برۆکسل رەخنەی لە وڵاتانی هاوپەیمانی گرت و وتی: کارەکانیان دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ناتۆ. وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا ئاماژەی بە «بەشدارییەکی بەرچاوی [ئەڵمانی] کرد لە ئۆپەراسیۆنەکانی ناتۆ کە ئەم بەشدارییە لەلایەن سەرۆک ئۆباما زۆر بەرز نرخێندرا.

## ئەنجومەنی پەرلەمانی ناتۆ

ئەو دەزگایەی کە ئامانجە ستراتیژییەکانی ناتۆ دادەنێت، ئەنجومەنی

پەرلەمانی ناتۆیە، کە لە دانیشتنی ساڵانەدا کۆدەبێتەوە ، هەروەها ئەو ئۆرگانەیە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێکهاتە پەرلەمانییەکانی حکومەتە نیشتمانییەکان لە وڵاتانی ئەندامدا کارلێک دەکات کە ئەندامی هەمیشەیی یان باڵیۆزن لە ڕێکخراوەکەدا.

ئەنجومەنی پەرلەمانی ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی یاسادانەرانی وڵاتانی ئەندامی ناتۆ و سێزدە ئەندامی هاوبەش لەخۆدەگرێت. بەڵام بە فەرمی پێکهاتەیەکی جیاواز لە هاوپەیمانییەکە پێکدەهێنێت. و ئامانجی ئەوەیە کە نوێنەرانی وڵاتانی ناتۆ بەشداری بکەن بۆ گفتوگۆکردن لەسەر سیاسەتە ئەمنییەکان لە ئەنجومەنی ناتۆ.

ئەنجومەنەکە لە ڕێی ڕاپۆرتی پێنج لیژنەوە خشتەی کاری سیاسی ناتۆ دادەڕێژێت ، کە بریتین لە لیژنەکانی:

لیژنەی تایبەت بە ڕەهەندە مەدەنیەکانی ئاسایش

لیژنەی بەرگری و ئاسایش

لیژنەی ئابوری و ئاسایش

لیژنەی سیاسی

لیژنەی زانست و تەکنەلۆژیا

ووڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی ناتۆ

لە ئێستادا ناتۆ ٣٠ وڵات لەخۆدەگرێت. کە تەنها ١٢ وڵاتیان لە ساڵی ١٩٤٩دا لە دامەزرێنەرانی ئەو هاوپەیمانیەتە بوون. ئەوانیش بریتی بوون لە: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا، بەلجیکا، کەنەدا، دانیمارک، فەرەنسا، ئایسلەندا، ئیتاڵیا، هۆڵەندا، لۆکسمبۆرگ، نەرویج، پورتوگال. لە ساڵی ١٩٥٢ تورکیا و یۆنان پەیوەندیان کرد و ئەڵمانیاش لە ساڵی ١٩٥٥ پەیوەندی پێوە کردن.

لە ساڵی ١٩٨٢ ئیسپانیا پەیوەندی بەو پەیماننامەیەوە کرد. دواتر لە ساڵی ١٩٩٩ کۆماری چیک و هەنگاریا و پۆڵەندا بوونە ئەندام. لە ساڵی ٢٠٠٤ دا بولگاریا و ئیستۆنیا و لاتڤیا و لیتوانیا و ڕۆمانیا و سلۆڤاکیا و سلۆڤینیا چوونە ناو ڕێکخراوەکەوە.

کرواتیا و ئەلبانیا لە ساڵی ٢٠٠٩ پەیوەست بوون. لە ساڵی ٢٠١٧ شدا مۆنتینیگرۆ پەیوەندی بەو هاوپەیمانییەوە کرد.

دوا ووڵاتیش کۆماری مەکەدۆنیای باکوور بوو کە لە ساڵی ٢٠٢٠ بوو بە ئەندامی ناتۆ.


سەرچاوەکان

- ویکیبیدیا... الموسوعةالحرة

- عەرەبی پۆست

- سایتی الموضوع

# خۆکوشتن

مافپەروەر: عوسمان محەمەد

خۆکوشــتن : بریتیــە لــە بێبەشــکردنی مرۆڤ لــە ژیــان و کۆتایــی هێنــان بــە پرۆســەی ژیــان ئەمــەش کردارێکــی دەرەکــی واتــە هانــدەر یاخــود ناوەکــی نائومێــدی لــە پرۆســەی ژیــان کــە هــۆکاری نەخۆشــی دەروونیــە. یــان هانــدان واتــە (تحریــض) لەلایــەن کەســێکی دیاریکــراوەوە.

لــە یاســای ژمــارە (٤٠٨)ی قانونــی عقوباتــی عێراقــی ژمــارە (١١١)ی ســاڵی (١٩٦٩) ســێ (٣) برگــەی بــە دیــاری کــراوی ئاماژە پێکــردووە.

١. برگــەی یەکــەم عقوبــەی هانــدەر ئەدرێــت بــە زیندانــی کــردن کــە لــە (٧ســاڵ) زیاتــر نەبێــت بەمەرجێــک هانــدەر هــۆکار بێــت بــۆ ئــەو خۆکوژییــە یــان ئاســانکاری کردبێــت بــۆ خۆکــوژ بــۆ ئــەو وەســیلەیەی کــە خــۆی پــێ بکوژێــت (لەحاڵەتێکــی تــری خۆکوژیــدا گــەر ئــەو کــردارە ڕووی نــەدا یــان خۆکوژیەکــە ڕووی نــەدا کەســی هانــدەر (حبــس) ئەکــرێ بەبڕیــاری حاکــم بــە (ظــروف مشــدد) چونکــە ئەژمــار دەکرێــت بــە (شــروع فــی القیــل)

٢. ئەگــەر خۆکــوژ ئەهلیــەی تــەواو نەبــوو واتــە تەمەنــی خــوار (١٥) ســاڵ بێــت یــان لــەڕووی دەروونیــەوە کامــڵ نەبــوو وەک دەرک و ئیــرادە ئــەوا دادوەر هەمــان حوکمــی (ظــروف المشــدد)ی بەســەر هانــدەردا ئەســەپێنێت واتــە (قتــل المتعمــد) و (شــروع فیــە)

٣. خۆکــوژ عقوبــە نادرێــت بەپێــی مــادەی (٤٠٨) لــە قانونــی عقوباتــی مەدەنــی مەگــەر لەحاڵەتــی ڕوو نەدانــی وەک لەمــادەی (١٨) ی قانــون عقوبــات {قــوی الامــن داخلــی ژمــارە (١٤)ی ســاڵی (٢٠٠٨)}. کــە ســزاکەی لــە (٦مانــگ) زیاتــر نیــە ئەویــش ئەگــەر پرۆســەکە ڕووی نــەدا و مافێــک هەبــوو بــۆ جێبەجــێ کردنــی پرۆســەی خۆکوژیەکــە.

وەمــاددەی (١٥) لەیاســای عقوباتــی {قــوی الامــن الداخلــی ژمــارە (١٤)ی ســاڵی (٢٠٠٨)} مــاوەی (١ســاڵ) دیــاری کــراوە نابێــت لەســاڵ زیاتــر بێــت بــۆ.

a. خــۆ نەخــۆش خســتن بــە ئەنقەســت بەمەبەســتی خــۆ دزینــەوە لەئەرکــی ســەربازی.

b. بەئەنقەســت خۆکــەم ئەنــدام کــردن لەلایــەن خۆیــەوە یــان کەســێکی ڕاســپێردراو بەمەبەســتی خــۆ دزینــەوە لەئــەرک یــان بەخشــینی لەئەرکــی ســەربازی.

مــاددە (١٦) یاســای عقوباتــی {قــوی الامــن الداخلــی ژمــارە (١٤)ی ساڵی(٢٠٠٨)} حوکــم ئــەدرێ بەمــاوەی (٦مانــگ) زیاتــر نەبێــت کەســێک ســەربازێک چارەســەری خــۆی نــەکات بــە ئەنقەســت بــە مەبەســتی خــۆ دزینــەوە لەئــەرک مــاددەی (١٧) لەقانونــی عقوباتــی {قــوی الامــن داخلــی ژمــارە (١٤) ی ســاڵی (٢٠٠٨)} حوکــم ئەدرێــت بەســەر ئــەو ســەربازانەی کــە هۆکارەکانــی مــاددەی

(١٥و١٦)ی تیا بەدی بکرێت ماوەی حوکمەکەی بریتیە لە (١ساڵ) کەمتر نەبێت.

(مەدەنی حوکم و برگەکانی ماددەکانی (١٨،١٧،١٦،١٥) لەیاسای عقوباتی {قوی الامن داخلی ژمارە (١٤)ی ساڵی (٢٠٠٨)} نایگرێتەوە تەنها ئەوانەی کە لەمادەی (٤٠٨)ی قانون عقوباتی عێراقی ژمارە (١١١) ی ساڵی (١٩٦٩)دا هەیە.

مادەی ١٨ لەیاسای {قوی الامن الداخلی ژمارە(١٤)ی ساڵی(٢٠٠٨)} خۆکوژ سزا ئەدرێت بە (٦مانگ) زیاتر نەبێت بەهۆکاری (شروع فی الإنتحار أو مرض علیە)

عقوبەی جرائم لە ماددەی (٢٥) لەقانونی عقوباتی عێراقی ژمارە(١١١)ی ساڵی (١٩٦٩) کەدیاری کراوە بۆ ماددەی (٤٠٦)

١. لەسێدارە دان

a. زیندانی هەتاهەتایی

b. زیندانی کردن کە ماوەکەی لە ٥ ساڵ زیاتر نەبێت یان زیندانی کردن کەماوەکەی ١٥ساڵە واتە زیندانی هەتا هەتایی.

٢. ماددەی (٢٢) هەمان یاسای عقوباتی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی (١٩٦٩) سزای (لەسێدارەدان) جێگرەوەکەی بریتیە لە (زیندانیی هەتاهەتای).

٣. مادەی (٢٧) لەهەمان یاسای عقوباتی عێراقی(١١١)ی ساڵی (١٩٦٩) بۆ سەرپێچیەکان (مخالفات).

الحبس البسیط ئەویش لە ٢٤ سەعاتەوە تا (٣مانگ) تا دەگاتە (٥ساڵ) کە ئەم حاڵەتە ئەبێت عنصوري جنایي تیابیت.

جیاوازی نێوان بکوژ و خۆکوژ ئەتوانین بەگوێرەی قانون عقوبات عێراقی ژمارە (١١١) ساڵی (١٩٦٩) کە لەماددەی (٤٠٨) کە لە٣ برگە پێک هاتووە و ئاماژەمان پێکردووە لەقانونی عقوباتی {قوی الامن الداخلی ژمارە (١٤)ی ساڵی(٢٠٠٨)} کە ماددەکانی (١٨،١٧،١٦،١٥) بەراورد بکرێت بەبکوژ جیاوازیەکان بریتیە لە:

ماددەی (٤٠٥) و (٤٠٦) لەقانونی عقوباتی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی (١٩٦٩) کە هەردوو ماددەکە بۆ (قتل عمد) سزای دیاری کردووە بەم شێوەیە :

ماددەی (٤٠٥) سجن مؤبد أو المؤقت.

ماددەی (٤٠٦) إعدام .

١. إعدام لەحاڵەتی :

a. بوونی پلان و ئامادەکاری پێش وەختە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە لەلایەن بکوژەوە

b. بەهۆی ژەهر خوارد کردنەوە یان یان بەکارهێنانی تەقەمەنی بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە لەلایەن بکوژەوە.

٢. کوشتن بەهۆی بەرگری لەشەرەف یاخود بکوژ رێگای وەحشیانە بەکار بهێنێت

٣. ئەگەر کوژراو لە بنەرەتدا بکوژێت.

٤. ئەگەر کوژراو کارمەندی حکومەت بێت یان بەو هۆیەوە بێت لەدەرئەنجامی کارەکەی.

٥. ئەگەر بکوژ بیەوێ دوو کەس یان زیاتر بکوژێت. زۆرێکی تریش لەو هۆکارانە.......




# هۆکارەکانی ململانێی نێو حزب

لەناو گشت حزب و پارتێکی سیاسیدا چەوساندنەوە و پەیڕەو نەکردنی دادپەروەری و نایەکسانی بەدی دەکرێت. کە ئەمەش وادەکات کۆمەڵێک کادری بەتوانا و باش پشتگوێ بخرێت و پەراوێز بخرێت و گوێ لەڕاو بۆچونیان نەگیرێت بەپێچەوانە هەندێ جاریش کادری بێ توانا و کەسێکی ناشایستە دێتە پێشەوە و پشتیوانیەکی باشی دەکرێت لە زۆر ڕووە وە بۆ نموونە پۆست و پلە و پایە و دەستکەوتی کەسی پێدەبەخشرێت. ئەم جیاکارییە لە نێوان کەسەکان یاخود لە نێوان هەڤاڵاندا دەبێتە هۆی ساردبوونەوە و کەم تەرخمی لە کاروباری نێو ڕێکخراوەییدا و وازهێنان لەکاری ڕێکخستن و دوورکەوتنەوە لە حزبەکەی. ئەم جیاوازی و نادادییە زۆرە و هەستیان پێ دەکرێت کە لەناو ئۆرگانەکانی ڕێکخستندا پەرەی سەندووە و دەشتوانین بڵێین بووە بە دیاردە بەتایبەت لە هەندێ شوێن و ئۆرگانی جیاوازدا خۆ ئەم هۆکارانەی کە باسی دەکەین ئەگەر چارەسەری نەکەین لەکاتی خۆیدا دەرئەنجام بەرەو هەڵدێر و لێواری مەرگ دەمانبات.

بەم چەند خاڵەی لای خوارەوە کێشە و ململانێ و هۆکارەکانی نێو حزب و ئۆرگانەکانی ڕێکخستن دەخینە ڕوو:

١-جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکان واتا هەربڕیارێک لەسەرەوە دەرچێت بەهەرهۆکارێک بێت هەڤاڵان پێوەی پابند نەبوون وجێ بەجێیان نەکرد. کێشە دروست دەبێت و ڕێگە خۆش دەکات بۆ ململانێ ناڕەواکان.

٢-دەستە گەریی و گێرەشێوێنی نەخۆشیەکی کوشندەیە لە ڕابردوودا

سەدان و دەیان ڕێکخراو و حزبی سیاسی لێک ترازاندوە. هەر هەڤاڵێک لە هەریلەو پایەیەکدابێت دەستەگەریی بکات کێشە لەنێوخودی ئۆرگانەکاندا دروس دەکات و ململانێ دروست دەبێت کە دەرئەنجام بەزیانی حزبەکەی و ئەو هەڤاڵە تەواو دەبێت.

٣-نەبوونی لێپرسینەوە و نەمانی دسپلین لەناو ئۆرگانەکانی ڕێکخستن. هۆکارن بۆ سەرهەڵدانی کێشە و گرفتەکان.

٤-نەبوونی هەڵسەنگاندنێکی تەندروست و پێشێل کردنی سزاو پاداشت بۆتە جێی ڕەخنەی کادر و هەڤالان. کێشەی زۆری بۆ ئۆرگانەکانی حزب و ڕێکخستن دروست کردوە.

٥- بەرزکردنەوەی پلەی ڕێکخراوەیی بەبێ ڕەچاوکردنی دیسپلینی حزبی و دوور لە ویژدان بۆتە جێی ڕەخنەی کادرانی حزب. هەروەها زۆر جار پێدان و بەخشینەوەی پلە لەلایەن هەندێک کەسی بەرپرسەوە کە هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەن بەرامبەر بەو کارەی پێی سپێردراوە. کەسانی نزیک لەخۆیان دێننە پێشەوە لە زۆر ڕووەوە پشتیوانی دەکەن و گەورەی دەکەن. کەشایستە و مافی خۆی نییە ئەم کارانەش دوورن لە بنەما و دیسپلینی حزبیەوە بەپێچەوانەوە کەسانی ماف خوراو و شایستە مافی پێشێل دەکرێت دووجار ململانێ لە ئێوان کەسانی نێو حزبدا دروست دەبێت و بە زیانی حزب تەواو دەبێت.

٦-ئیرەیی و چاوچنۆکی و خۆبەگەورە زانین بەرامبەر کەسانی دیکە دەبێتە هۆی سەرهەڵدان و دروست بوونی ململانێ و ناکۆکی نێوان ئۆرگان و کەسانی نێو ڕێکخستن.

٧- ململانێی نێوان تاکە کەسەکان جۆرە ململانێیەکە لەنێوان دوو هەڤاڵدا پەیدا دەبێت لەیەک شوێندا کار دەکەن کە یەک پلەی ڕێکخراوەییان هەیە. شارەزایان ئەم جۆرە ململانێیەیان بە دۆخێکی ترسناک داناوە لەبەر ئەوەی لە هەر دەزگایەکی حیزبی یا حکومیدا بەدی کرا دەبێتە هۆی دروست بوونی گەندەڵی و بەربەرەکانی دروست دەبێت.

٨- ئەگەر لەلایەن لێپرسراوی یەکەمەوە هەر ڕێنمای و ئاراستەکراوێکی جیاواز لەنێوان ئۆرگانەکانی ڕێکخستن و کەسەکاندا هەبوو دەبێتە هۆی کێشە و سەرهەڵدانی ململانێکان.

٩- هەرهەڤاڵێک لەهەر ئاست و پلە و پایەیەکدا بێت ئەگەر ئاستی هۆشیاریی نزم بوو ئەوە دەبێتە هۆی مایەی کێشە و ململانێ لەنێوان خۆی و کەسی بەرامبەردا.

١٠- نەبونی هاوئاهەنگی لە بەڕێوەبردن و کاروباری ڕۆژانەدا و پەیڕەو نەکردنی گیانی تەبایی و برایەتی لەنێوان

کەسەکاندا، هۆکارێکە بۆسست بەرێوەبردنی ئیش و کارەکان و سەرهەڵدانی کێشە و ململانێکان لەناو ئۆرگان و ڕێکخستنەوەکاندا.

١١- هەر هەڤاڵێکی کادر لەکارەکەی خۆیدا زۆر دڵسۆز و چالاک بوو ئەگەر ئەو بەرپرسە ستایشی نەکرد و جیاوازی نەکرد یان سوپاس و دەست خۆشی نەکرد لەگەڵ هەڤاڵێکی تردا کە سست و لاوازە، دەبێتە هۆی دروست بوونی ململانێ و سارد بوونەوەی کەسەکە.

١٢- نەبوونی یەکسانی و هەستکردن بە چەوساندنەوە و زوڵم و سزادان، بەبێ ئەوەی ئەو هەڤاڵە تاوان باربێت یا ئەو کارەی کردبێت ململانێ لەنێوان ئەو کەسەو کەسی بەرامبەر و ئۆرگانەکان پەیدا دەبێت.

١٣- نەبوونی یەکسانی لەکاتی دابەشکردنی پاداشت ئەگەر جیاوازی کرا لەنێو کەسەکانی ڕێکخستندا کەسانی زۆر چالاک پشتگوێ خران، ئەوە دەبێتە هۆی ململانێ لە نێوان ئەو هەڤاڵە و بەرپرس لەو کارەدا.

١٤- قسەکردن و سووک کردنی یەکتر لەدەرەوەی کۆڕ و کۆبوونەوەی فەرمیدا، هۆکارێکی دیکەیە بۆ زیان گەیاندن بەپێگەی ڕێکخراوەکە و خودی هەڤاڵەکە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی ململانێکان.

١٥- ئەگەر دەسەڵات درایە دەست هەر هەڤاڵێک و پاشان لێیان وەرگرتەوە لەلایەن سەروی خۆیەوە، ڕەوا بێت یان ناڕەوا ئەوە کێشە و ململانێ دروست دەبێت لەبەر ئەوەی ئەو کەسە بەهەر شێوەیەک بێت خۆی بەخاوەن ماف و ماف خوراو دەزانێت.

١٦- دروستکردنی پروپاگەندە و هەواڵی ناڕاست زۆرجار دەدرێتە پاڵ کەسانێکی بێ تاوان و ڕاستگۆ و دلسۆز و پاک، ئیرەی پێ دەبەن لەئەنجامی ناکۆکی و دوو بەرەکی کەسەکاندا هەندێک لەمرۆڤەکان بەداخەوە سروشتی ژیانیان وا گوزەراندووە کە ئەم جۆرە کەسانەی ئەمە ڕەفتاریانە دورن لە بەهای مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی و ئاینی ئەمانە هۆکارن بۆسەرهەڵدانی کێشە و ململانێ و بەرەبەرەکانی.

١٧- هۆکاری جۆراوجۆر دەتوانن ململانێ دروست بکەن وەک کەسایەتیە ناسازو نەگونجاوەکان و لایەنی دەروونییان ناجێگیرە و ناتوانن لەئیش وکاری ڕۆژانەیاندا لەگەڵ کەسانی دیکە بژین و خۆگونجێن بن و سەرکەوتووبن.

١٨- ئەگەر لەلایەن هەر هەڤاڵێکەوە دەستوەردان بکرێت لەکاروباری هەر ئۆرگان یان هەر کارێکی دیکە لە کاروباری ڕۆژانەدا، کەکاری فەرمی تایبەتی خۆی نیە ئەم بەشداری کردن و دەست وەردانە ڕێگە خۆش

دەکات بۆ سەرهەڵدانی کێشە و گیر و گرفت لەنێوان هەڤاڵان و ئۆرگانەکانی ڕێکخستندا.

١٩- لەلایەن هەر بەرپرسێکی حزبی یان حکومییەوە گەر پرس و ڕاوێژ نەکرا لەسەر بڕیار و ئیش وکارەکان دەسەڵاتی تاکڕەوانەی تیا بەکار هات دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشەکان و لەئەنجامدا سەرکەوتوو نابێت لەکارەکەیدا.

٢٠- هەر هەڤاڵێک کە لەهەر لێپرسراوێتیەکدا بێت ئەگەر زۆربەی دەسەڵات و ئیش و کارەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێنا. ململانێ دەکەوێتە نێوان ئەو هەڤاڵە و کەسەکانی ترەوە کەپێکەوە لەشوێنێک کار دەکەن و هاو پێشەی یەکن.

٢١- کەم تەرخەمی و سست بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکەی بەکەسێک سپێردراوە وا دەکات سەرکەوتوو نەبێت. ئەمەش دەبێتە مایەی کێشە لەنێوان ئەو کەسە و بەرپرسی یەکەم لەو کارەدا.

٢٢- کەم وکورتی و ناتەواوی کاروباری کارگێڕی خزمەتگوزاری دەزگا حکومیەکان کەڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی بەسەر ئۆرگانە حزبیەکاندا دەبێت و دەبێتە مایەی کێشە و گرفت لەنێوان کەسانی ناو ڕێکخستن و حکومەتدا.

٢٣- ئەگەر چی هەمووشمان بۆیەک ئامانج کار و خەبات دەکەین و بیر و بۆچوونی سیاسیمان یەکە. بەلام. کێشە

**ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەم هەر هەڤاڵێک کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی تایبەت و دیاری کراو کەهەوڵ دەدات بەدەستی بهێنێت. هەندێ جار کەسانێک بەهەر هۆکارێک بێت ڕێگری دەکەن و دژی خواست و بەرژەوەندییەکەی ڕادەوەستن، کەئەمەش دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی ململانێیەکی سەخت لەنێوان کەسەکاندا و ڕاستەوخۆ سلبیاتی دەبێت لەسەر بەرەوپێشچوونی ئەو ئەو ئۆرگانەی کاری تێدا دەکەن.**

لەنێوانماندا دروست دەبێت. بەهۆی ئەوەی هەریەکەو خۆی بە چالاکتر و دڵسۆزتر دەبینێت لەکار وبارەکەیدا. بەبۆچونی ئێمە ٧٠٪ سەرهەڵدانی گرفت و کێشەکان بەهۆی کاری شەخسیەوە دەبێت. ئەوەک بۆ بەرژەوەندی گشتی کەدەبێتە مایەی گرفت بۆخۆی و ئۆرگانەکەی.

٢٤- ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەم هەر هەڤاڵێک کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی تایبەت و دیاری کراو کەهەوڵ دەدات بەدەستی بهێنێت. هەندێ جار کەسانێک بەهەر هۆکارێک بێت ڕێگری دەکەن و دژی خواست و بەرژەوەندییەکەی ڕادەوەستن. کەئەمەش دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی ململانێیەکی سەخت لەنێوان کەسەکاندا و ڕاستەوخۆ سلبیاتی دەبێت لەسەر بەرەوپێشچوونی ئەو ئەو ئۆرگانەی کاری تێدا دەکەن. بۆیە لێرەوە بەربەرە:انێی ناتەندروست دروست دەبێت و دەرئەنجام بەزیانی حزب و کەسەکان کۆتایی پێ دێت.

٢٥- بۆچوون و هەڵوێستی جیاواز زۆر کات بۆ هەرکارێکی ڕێکخراوەیی یان حکومی کەدێتە پێشەوە. پێویستی بەکۆبوونەوە و ڕاوێژ کردن و گفتوگۆ و بڕیاردانە لەگەڵ هەڤالانی پەیوەندیدار بەئەم بابەتانە. زۆرجار لەئەنجامی لێک نەگەیشتن و هەڵوێستی جیاواز گرفت دروست دەبێت. دەبێتە مایەی ناڕەزایەتی دەربڕین لەنێوان هەڤالاندا. دەرئەنجام ئەگەر چارە نەکرێت بەزیانی حزب و هەموو لایەک کۆتایی دێت.

٢٦- پشتگوێ خستن و گوێ نەگرتن لەکەم و کورتیە کانی خوارەوەی ناو ڕێکخستن دەبێتە هۆی ناڕەزایی دەربڕین کێشە لەناو ڕێکخستنەکاندا.

٢٧- ئەگەر هەر هەڤاڵێکی کادر قسەو ڕێنمایی لەدەرەوەی ئۆرگانە فەرمیەکانی ڕێکخستن وەرگرت دەبێتە مایەی کێشە بۆخۆی و ئەو ئۆرگانەی کەکاری تێدا دەکات و کێشە دروست دەبێت لەنێوان کەسەکە و ئەو ئۆرگانەی کە کاری تێدا دەکات.

٢٨- هەندێک جار کادر یان هەڤاڵێک کەخاوانی کەسایەتیەکی جوان و خۆشەویستە لەنێو ئەندام و جەماوەر و خەڵکی ناوچەکەدا. کەدڵسۆز و چالاکە بەداخەوە زۆر جار لەلایەن هەندێک بەرپرس و کادر و هەڤاڵی هاوپیشەی خۆیەوە دژایەتی دەکرێت و کێشە و گرفتی بۆ دروست دەکەن و ئیرەیی پێ دەبەن بۆ ئەوەی سەرکەوتوو نەبێت لە کارو باری خۆیدا ئەمە دەبێتە هۆکارێک بۆسەر هەڵدانی کێشە و ململانێ. باشتر وایە بەشانازیەوە ڕێزی لێ بگیرێت و پشتیوانی بکرێت.

٢٩- بەهۆی ململانێی نێوان کەسە دەست ڕۆیشتووەکان و ناداد پەروەری هەندێک جار هەڤاڵێک بۆماوەیەکی

زۆر لــە پۆســت و پلەیەکــدا دەمێنێتــەوە بــەرەو پێشــچوونی وای بەخۆیــەوە نابینیــت بۆیــە خــۆی بەمــاف خــوراو دەزانێــت. لەپــڕدا کەســێک کــە شایســتە بــەو پلەو پۆســتە نیــە مەبەســت ئەوەیــە کەمافــی خــۆی نیــە و فــەرز دەکرێــت بەســەر کەســی مــاف خــورودا ئەمــەش هــۆکارە بۆ دروســت بونــی کێشــە لەنێــوان کەســەکاندا وگیــر و گرفــت دروســت دەبێــت و دەر ئەنجــام سســتی لــە بەڕێوەچوونــی کاروبــاری ئــەو ئۆرگانــەی کاری تێــدا دەکــەن بەخــۆوە دەبینێــت.

٣٠- شــاردنەوەی ڕاســتیەکان و ڕاســتگۆ نەبــوون لەگــەڵ هەڤاڵانــی بەرامبــەر یەکێکــن لەدیــاردە خراپــەکان وهــۆکارن بۆســەرهەڵدانی کێشــەو گیروگرفــت لەنێــوان ئۆرگانــەکان و کەســەکاندا.

٣١- نەبــوون و نەمانــی بڕوانەبــوون لەنێــوان هەڤاڵانــدا لەهــەر ئاســت و پلــە و پۆســت و پایەیەکدابێــت. لەبەڕێوبــردن و ئیــش وکاری ڕۆژانــەدا لەنێــوان کەســەکان و ئۆرگانەکانــی ڕێکخســتندا هــۆکارن بــۆ ســەرهەڵدانی کێشــەو بەربەرەکانــێ.

٣٢- بەداخــەوە هەندێــک جــار لای هەندێــک کەســانی بەرپــرس هەســت بەجیــاوازی دەکرێــت لــە بەڕێوبــردن و کاروبــاری ڕۆژانــەدا لەنێــوان ئــۆرگان و کەســەکاندا ناوچەگەریەتــی زاڵــە بەســەر بیرکردنــەوە وعەقڵییەتیانــدا لــە کارەکانیانــدا ئــەم جــۆرە بیرکردنــەوە و ڕەفتارانــەی هەندێــک بەرپرســان زیانی زۆر بەخۆیــان وحیزبەکەیان دەگەیێنێــت و تووشــی ڕووبــەڕوو بوونــەوەی ڕەخنــەی زۆر دەبێــت خۆشەویســتی و متمانــەی لای هاوپیشــە وهاوکارەکانــی لــە دەســت دەدات. دەرئەنجــام ســەرکەوتوو نابێــت لــە کارەکەیــدا کێشــە دروســت دەکات.

٣٣- لەلایــەن هەندێــک لــە بەرپرســانەوە زۆرجــار پــرس و ڕاوێــژ ناکرێــت لەگــەڵ کەســانی بەرپــرس و پیوەنــدار بەکارەکــە .بەپێچەوانــەوە ڕاوێــژ بەکەســانێک دەکرێت نزیــک لەخــۆی بەهەرهۆکارێــک بێــت .کــە کاری فەرمــی ئــەو کەســە نییــە ئەمــەش دورە لــە دســپلینی حزبــی .ئــەم جــۆرە ڕەفتارانــە دەبنــە مایــەی کێشــە لــە نێــوان ئۆرگانەکانــی ڕێکخســتن وکەســەکاندا.

## پێشنیار و چارەسەر

بەشــێکی زۆرلەکێشــە و گیروگرفــت وهۆکارەکانــی ســەرهەڵدانی ململانێــی نێــوان کەســەکانی نێــو ئــۆرگان و ڕێکخســتنەکانی حــزب بــاس کــرا. کــە ڕۆژانــە ڕوو دەدەن بونەتــە دیــاردە لــە نێــوان کەســەکانی نێــو حــزب و ئۆرگانەکانــی ڕێکخســتندا. پێمــان وایــە ئەگــەر ڕۆحیەتێکــی زینــدوو هەبێت بەشــێوەیەکی دەدپەروەرانــە و تەندروســت ئــەم چەنــد خاڵــەی لای خــوارەوە پەیــڕەو بکرێــت دەتوانرێــت ناکۆکــی و بەربەرەکانیــەکان وەلاوە بنرێــت و بەشــێکی زۆر لــە

کێشــەکان چارەســەری گونجاویــان بــۆ دەکرێــت و دەرئەنجــام دەبێتــە مایــەی نەمانــی گرژیــەکان و بــەرەو پێــش چــوون و ســەرکەوتن لــە نێــوان کەســەکان و ئۆرگانەکانــی ڕێکخســتن و حزبــدا.

١-بەرلــە هەمووشــتێک پەیــڕەو کردنــی دادپــەروەری و پاراســتنی گیانــی تەبایــی و برایەتــی لەنێــوان هەڤــاڵان و کەســەکاندا. کێشــەو گرفتــەکان کۆتایــی پێدەهێنرێــت و دەبێتــە چارەســەر لەنێــوان ڕێکخســتن و ئۆرگانەکانــی حزبــدا.

٢-پێویســتە کەســی یەکــەم لەنێــو پارت و ڕێکخــراوە سیاســییەکاندا باشــترین ڕێــگا بگرێتــە بــەر بــۆ نەهێشــتنی ململانێــکان تــا زیــان بەخــۆی و ئامانجــی حزبەکــەی نەگەیێنێــت.

٣-گرنگیــدان بــە بــواری فکــر و هۆشــیارکردنەوەی هەڤــاڵان کاریگــەری هەیــە و دەبێتــە هــۆی کــەم کردنــەوەی ململانــێ نــاڕەواکان.

٤-هەندێــک لــە توێــژەران باوەڕیــان وایــە هەندێــک کات بــۆ چارەســەرکردنی ناکۆکییــەکان پێویســتە هێــز بەکاربهێنرێــت. لــەو ڕێگەیــەوە زۆر جــار ڕێگریــی دەکرێــت لــە دروســت بوونــی کێشــەکان (ڕەفیــق ســاڵح بەڕێوەبــردن و چەنــد بابەتێکــی هەڵبــژاردە )

٥-نــەرم و نیانــی ومرونــەت نوانــدن واتــە دڵدانــەوەی لایەنــە ناکۆکــەکان بەزمانێکــی گونجــاو و کاریگــەر بــۆ گێڕانەوە و ئاســایی کردنــەوەی پەیوەندییــەکان و بەکارهێنــان و پەیــڕەو کردنــی سیاســەتی چەپکــە گوڵەکــە دەبێتــە هــۆی چارەســەر یــان ڕازی کردنــی تاکــەکان.

٦-پێویســتە لێپرســراوی یەکــەم واز لــە هەنــدێ دەســەڵاتی خــۆی بهێنێــت و ببەخشــێت بــە خــوارەوە واتــا شــۆڕکردنەوەی دەســەڵاتە ئۆرگانییــەکان جێبەجــێ کردنــی ئــەم پرەنســیپە لــە ڕێکخســتندا دەبێتــە هــۆی دروســت بوونــی کادیــر و وەلاوە نانــی ململانێــکان. بۆنونــە هەندێــک لــە زانایــان پێیــان وایــە هــەرکات ویســتت کەســێک باشــتر بناســیت ئــەوا ئەرکێکــی پــێ بســپێرە

٧- بەشــداریکردن و دەســتێوەردانی لایەنــی ســێیەم بۆ یەکلایــی کردنەوەی کێشــەکان زۆرکات دەتوانێــت هەوڵــی چارەســەرکردنی ململانێــکان بــدات لەبــەر ئــەوەی لایەنــی ســێیەم باشــتر گوێــی لێدەگیرێــت و وەک کەســێکی بــێ لایــەن ڕای وەردەگیرێــت و تەماشــا دەکرێــت و بــۆ چوونیــان بەهەنــد وەردەگیرێــت.

٨- بــۆ چارەســەرکردنی ئــەو کێشــەو ناکۆکیانــەی بــە هــەر هۆکارێــک بێــت کــە ســەر هەڵــدەدەن پێویســتە لەلایــەن کەســی یەکەمــەوە کــەم تەرخەمــی لــێ نەکرێــت و لــە کاتــی خۆیــدا چارەســەری گونجــاوی بــۆ بکرێــت. ئەگــەر گرفتەکــە بچوکیــش بێــت بــۆ ئــەوەی گــەورە نەبێتــەوە و نەبێتــە دیــاردە لەنــاو

ئۆرگانەکانی ڕێکخستندا.

٩- بەشداریکردن و لێپرسراوی یەکەم یا دەسەڵاتی باڵا چوونە کێشەکان زۆرکات لەلایەن هەڤالانی خوارەوە گوێی لێ دەگیرێت وەک دادوەرێکی باش دەتوانێت ئەم ڕۆڵە ببینێت، بەمەرجێک دادوەرێکی دادپەروەرانە بێت و جیاوازی نەکات لە نێوان کەسەکاندا، پەیڕەو کردن و جێبەجێ کردنی ئەم ڕەفتارە دەبێتە هۆی نەمان و چارەسەرکردنی کێشەکان.

١٠-هەرهەڤاڵێک لە پلەکەی یان شوێنکەی گوازرایەوە یا گۆڕانی بەسەردا هات دەبێتە هۆی دەربڕینی نارازیی، بەڵام لەو کاتەدا لێپرسراوی یەکەم دەتوانێت لە ڕێگەی دانیشتن و کۆبوونەوە لەو بارەوە زانیاری بدات و دەبێتە هۆی ڕەزامەندی ئەو هەڤاڵە و چارەسەرکردنی کێشەکە، ئەوکات گۆڕانکارییەکە سەرکەوتوو دەبێت.

١١-لەلایەن لێپرسراوی یەکەمەوە شارەزا بوون و بە ئاگا بوون لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕێکخستن و بەتەنگەوە هاتنیان و بەدەمەوە چوونیان دەبێتە هۆی نەمانی کێشەکان و چارەسەرکردنیان.

١٢- پرس وراوێژکردن بۆ هەرکارێک لەگەڵ هەڤالانی خوارەوە، دەبێتە هۆی سەرکەوتنی کارەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان.

١٣- لە بڕیاردانەدا پێویستە پەلە نەکرێت، پرس و ڕاوێژ بە هەڤالانی هاوپیشە بکرێت، بەم ڕەفتارە کەسی بەرپرس سەرکەوتوو دەبێت لە کارەکەیدا.

١٤-دەبێت بەرپرسی یەکەم گوێڕایەڵی ڕەخنە و پێشنیار و داواکارییەکانی خوارەوە بێت و دڵی گەورەبێت بەرامبەر بە ڕەخنە و پێشنیاری هەڤالانی، ئەمەش بۆ خۆی ڕێگەیەکە لە ڕێگاکانی سەرکەوتن.

١٥-بەرپرسی یەکەم دەبێت دڵسۆز و خەم خۆربێت و ئەرکی ئەخلاقی سەرشانیەتی کە دەبێت هەوڵ بدات گیانی تەبای و برایەتی لە نێوان کادر و ئۆرگانەکاندا بچەسپێنێت.

١٦-ئەوانەی لێپرسراوی ئۆرگانن یان لەگەڵ هەڤاڵەکانیان دا لە ئۆرگان و شوێنێک کاردەکەن دەبێت دڵسۆزی و پەرۆشی زاڵبێت بەسەریدا و نابێت هەرگیز بیر لە تۆڵە سەندنەوە بکات، بەم کردارەش سەرکەوتوو دەبێت و خۆشەویستی بەدەست دەهێنێت لە لایەن و هاوڕێ و هاوکارانی.

١٧-کارکردن بە بەرنامە و پەیڕەوی نێوخۆی حزب زۆرێک لە نادادی و کێشە و گیروگرفتەکان چارەسەردەکات، دەبێتە مایەی سەرکەوتن و زاڵ بوون بەسەر کۆسپەکاندا، کارکردن بە دەستووری حزب ڕازی کردنی ئەندام و هەڤالان بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

# سەردەمی ڕۆبۆتەکان

ئیدریس جەبار



پسپۆڕ و شارەزایانی بواری سەربازی، باس لەو «شۆڕش»ە راستەقینەیە دەکەن کە لە زانستی رۆبۆتەکاندا رویداوە کە لە مەودایەکی نزیکدا رێگە بۆ بەرپابوونی کودەتایەک بەسەر چەمکی جەنگ، یان چەمکی کوشتن و کاولکاریدا، دەهێنێت.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئەو جەنگاوەرە نوێیانە کێن، توانا لە رادەبەدەرەکانییان چین، ئەو ئامێر و تەکنەلۆژیایانە چۆنن کە لە جەنگی رۆبۆتەکاندا بەکاردەهێنرێن، ئەو وڵاتانە کامانەن کە بەشداری لە بەرنامەی «بەرۆبۆتکردن»دا دەکەن لە بوارە مەدەنی و سەربازییەکان؟

## رۆبۆتی چەکدار

ناوەندە رۆژنامەوانییەکان لەم ماوەیەی دواییدا قسەوباسی زۆرییان لەبارەی ئەو پەرەسەندنانە بڵاوکردەوە کە لەبواری رۆبۆتەکاندا هاتوونەتە ئارا و دەگوترێت ئیسرائیل تەئکید لەسەر بەرنامەیەکی پرچەککردن دەکاتەوە کە پشت بە «رۆبۆتی چەکدار»، «رۆبۆتی بکوژ» و تەنانەت «رۆبۆتی

خۆکـــوژ دەبەســـتێت.
مەســـەلەکە لێـرەدا تەنیـا خـۆی لـە جێبەجێکردنـی ئەرکـە جەنگییەکانـدا نابینێتـەوە کـە لەڕێـی (فڕۆکـە بێفڕۆکەوانـەکان)ەوە ئەنجـام دەدران، بەڵکـو لـە ئامادەکردنـی سـوپایەکی تەواوەتـی ڕۆبۆتەکاندایـە، لە سـەربازەکان و فڕۆکەوانـەکان و موشـەکەکانەوە بگـرە تـا دەگاتـە پرۆگرامـی کاولکاریـی هەمەلایەنـە لـە گۆڕەپانەکانـی شـەڕدا.
ئەو ڕاپۆرتانەی بڵاوکراونەتەوە سـنووردارن و هەندێکیـان باس لـە «مایکـرۆ ڕۆبۆتەکان» (جەنـگاوەرە کێـش سـوکەکان) دەکـەن کـە سـی سـاڵ لەمەوبـەر دەسـت بـە دروسـتکردنیان کـرا، و لـە سـاڵی ٢٠٣٥ دا لەبـری هێـزە شـەڕکەرەکان لـە شـەڕەکاندا بەکاردەهێنرێـن.
لەگـەڵ ئەمەشـدا لـە ڕوانگـەی داهێنانە نوێیـەکان، دەکرێـت سـاڵ لـەدوای سـاڵ، گۆڕانکاریـی و دەسـتکاریی لـەو پلانـەدا بکرێـت.
بەڵگـەش لەسـەر ئـەوە، زیادبوونـی ژمـارەی فڕۆکـە بێفڕۆکەوانەکانـە کـە بـە تەنیـا لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا تـا سـاڵی ٢٠٠٠، پەنجـا فڕۆکـەی جـۆری (درون) بـوون، بـەڵام لـە سـاڵی ٢٠١٠دا ژمـارەی ئـەو جـۆرە فڕۆکانـە بـۆ حـەوت هـەزار فڕۆکـە زیادیـان کرد. لەئێستاشـدا بـێ شـمارن کـرد.
ئـەو جـۆرە فڕۆکانـە بـۆ چەنـد سـاڵێک دەچێـت، چەنـدان پرۆسـەیان ئەنجامـداوە کـە بـە «پرۆسـە گڵاوەکان» یـان مەترسـیدارەکان دەناسـرێن، لـە چەنـد ناوچەیەکیشـدا پرۆسـەکان بەشـێوەیەکی بەرچـاو زیادییـان کـردووە.

## بەرنامەی بە ڕۆبۆتکردن

بەرنامـەی «بەڕۆبۆتکـردن» یـان مامەڵەپێوەکـردن و هەڵسـوڕاندنی لەخـۆوە بـە ئامێـر و کەرەسـتە جەنگییـەکان، لەئێسـتادا لەزیاتـر لـە چـل وڵاتـدا پـەرەی پێدەدرێـت.
ڕاپۆرتـەکان بـاس لـەوە دەکـەن، بـازاڕی فڕۆکـە و هێلیکۆپتـەرە بـێ سـەرنشـینەکان، لەمـاوەی چەنـد سـاڵی داهاتـوودا دەگاتـە سـەد ملیـار دۆلار. ویلایەتـە یەکگرتـووەکان یەکـەم وڵات بـوو کـە پشـتی بـە ئامێـری ڕۆبۆتـە جەنگییـەکان بەسـت.
سـوپای ئەمریـکا لەئێسـتادا نزیکـەی دەیـان هـەزار یەکـەی میکانیکـی و ئۆتۆماتیکـی هەیـە کـە لـە دوورەوە مامەڵەیـان پێوەدەکرێـت.
لەمـاوەی بیسـت سـاڵی داهاتـوودا، دە هێنـدەی ئێسـتا ژمـارەی هێلیکۆپتـەر

و فڕۆکــە بێفڕۆکەوانــەکان لــە هێــزی ئاســمانی ئەمریــکادا زیــاد دەکات. و پنتاگۆنیــش لەئێســتادا کڕینــی ئــەو جــۆرە ئامێرانــەی لــە کڕینــی فڕۆکــە ئاســاییەکان، زیاتــر کــردووە.

لــە شــەڕ و هەندێــک ئۆپەراســیۆنی تایبەتــدا، ئەمریکاییــەکان بەشــێوەیەکی کارگــەر هێلیکۆپتــەر و فڕۆکــە بێفڕۆکەوانــەکان بەکاردەهێنــن.

بەپێــی پلانەکانــی هێــزی ئاســمانی ئەمریــکا بێــت، لەچەنــد ســاڵی داهاتوودا بڕێکــی زۆر ئامێــر و کارەســتەی جەنگــی هەمەجــۆر کــە لــە دوورەوە مامەڵەیــان پێوەدەکرێــت، بەکاردەهێنرێــن و لــەڕووی قەبارەشــەوە، هەمەجــۆر و جیاوازدەبــن کــە بچوکترینیــان هێنــدەی مێشــە هەنگێــگ دەبێــت.

ئیســرائیلیش بــە نیــازە بــە هەمــان شــێوە ژمــارەی فڕۆکــە بێفڕۆکەوانــەکان و ڕۆبۆتــە شــەڕکەرەکانی زیــاد بــکات. لەمــاوەی چەنــد ســاڵی داهاتــوو، ڕۆبۆتــەکان ســێ یەکــی کــۆی گشــتی کەرەســتە جەنگییەکانــی ئیســرائیل پێکدەهێنــن.

زۆرێــک لــە پســپۆڕ و شــارەزایانی بــواری کەرەســتە جەنگییــەکان و پیشەســازی جەنگــی، وایدەبینــن دوا ڕۆژ و ئاینــدە بــۆ ڕۆبۆتەکانــە. تادێــت ئــەو ڕۆبۆتانــە زیاتــر ئاڵــۆز دەبــن و کەمتــر پشــت بــەوە دەبەســتن کــە لەلایــەن مرۆڤــەوە مامەڵەیــان پێوەبکرێت. بەشــێوەیەکی پلەبەندیــش هەمــوو ئــەو فڕۆکــە و تانــک و کەشــتییە جەنگیانــە وەلادەنێــن و ڕایاندەماڵــن کــە کــە پشــت بــە تیمــە مرۆییــەکان دەبەســتن.

بــەلام ئەوانــەی گومانیــان لــە ئاینــدەی ڕۆبۆتــەکان هەیــە، پێیانوایــە ڕۆبۆتــەکان ناتوانــن جێگــەی مــرۆڤ بگرنــەوە. ئــەوەی ئێســتاش دەوترێــت ســەبارەت بــە ڕۆبۆتــی شــەڕکەر، هەڵمەتــی ڕاگەیاندنەکانــە. چونکــە بــە وتــەی ئــەوان، ئــەو ڕۆبۆتانــە کەموکــوڕی زۆر و کێشــەی ناقۆڵایــان هەیــە.

## ڕۆبۆتە شەڕکەرەکان

بەکارهێنانــی ڕۆبۆتــەکان لــە شــەڕ و ئەرکــە تایبەتەکانــدا، وەک تاقیکردنەوەکان تائێســتا ســەلماندویانە، لایەنــی خراپیــان زۆرە. چونکــە زۆربــەی قوربانیانــی فڕۆکــە بێفڕۆکەوانــەکان، خەڵکــی مەدەنــی بــوون.

بەپێــی هەڵســەنگاندنی پســپۆڕ و شــارەزایان، قوربانیانــی بۆردومانەکانــی ئــەو جــۆرە فڕۆکانــە لــە ســاڵی ٢٠٠٤ نزیکــەی ٢٣٣٠ کــەس بــوون کــە

لەنێوانیاندا ٨٨٠ کەسیان مەدەنی بوون و ١٧٨ مەنداڵیان تێدا بوو. ئەو جۆرە فڕۆکانە بەشێوەیەکی ڕۆژانە بونەتە سەرچاوەی تۆقاندن بۆ دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی ویلایەتە یەککگرتووەکان دەیەوێت وانەی «دیموکراتیان» دابدات وەک ئەفغانستان و پاکستان.
فلادیمێر ئیسایف شرۆڤەکاری سیاسی



و سەربازی دەڵێت: «ئەو تەکنیکەی لەو بۆردومانانەدا بەکاردەهێنرێت. جیاوازی لەنێوان مەدەنی و سەربازییەکاندا ناکات. مەترسی ڕانەگەیەنراوی ئەو جۆرە فڕۆکانە ئەوەیە کە ڕەنگە لە ئایندەدا لەگەڵ بۆمب و تەقەمەنییەکاندا، مەوادە کیمیاوییەکان و ئەوانی تر هەڵبگرن. دەکرێت بگوترێت. سوپای ئەمریکا و (سوپاکانی فەنسا و ئیسرائیل بەشێوەیەکی تایبەت) هەوڵدەدەن. بۆ

جەنگەکانی ئاینده ئەو جەنگاوەرانە زیاد بکەن کە توانایەکی لەڕادەبەدەریان هەیە. ئەو جەنگاوەرانە نە دەخەون نە بریندار دەبن. هێلیکۆپتەرە بێ سەرنشینەکان و مرۆڤە دەستکردەکان. نمونەیەکی سەرەتایین.

## توانایەکی لەڕادەبەدەر

شارەزایان، فڕۆکە سیخوڕییە زەبەلاحەکانی ئەمڕۆ بە دەرکەوتنی تانک و فڕۆکە جەنگییەکان دەشوبهێنن لە یەکەمین جەنگی جیهان.
سوپای ئەمریکا لەئێستادا و لەسەر ئەو تەکنیکانە. هێندەی مەشق بەو فڕۆکەوانانە دەکات. هێندە مەشق لەسەر تەقاندنی قازیفە و فڕۆکە جەنگییە ئاساییەکان ناکات.
ڕۆناڵد ئارکن. توێژەر لە زانستی ڕۆبۆتەکان لە پەیمانگەی جۆرجیا بۆ زانستە تەکنەلۆژییەکان پێیوایە. نەبوونی سۆز و بەزەیی لای ڕۆبۆتەکان. بەخاڵی لاواز دانانرێت. بەڵکو خاڵێکی بەهێزی ئەو ئامێرانەیە.
لەڕێی پرۆگرامکردنیان بەچەشنێک. کردەوەکانیان لەگەڵ ڕێککەوتننامەکانی جنێڤدا دەگونجێت. ئەو بڕوای وایە.

دەکرێت ڕۆبۆتێک دروست بکرێت لە گۆڕەپانی شەڕدا تواناکانی زۆر لە مرۆڤ زیاتر بێت.
ڕۆناڵد ئارکن خەون بە ڕۆبۆتێکەوە دەبینێت کە توانایەکی سەربازیی لە رادەبەدەری هەبێت و تواناکانی زۆر لە توانای مرۆڤ زیاتر بن. لە هەمان کاتدا هەڵگری ڕەوشت و ئاکاری جوامێری هەبێت و خانەدان بێت. ئەو فەرمانە سەربازیانە ڕەتبکاتەوە کە لەگەڵ یاساکانی جەنگ و بنەماکانی ڕێککەوتننامەی جنێڤدا یەکانگیرنابن.
هانس یورگ کیرۆفسکی زانای بواری کۆمپیوتەر، دژ بە ئارکن دەوەستێت و دەڵێت: «کەس بەتەواوەتی نازانێت، چۆن دەکرێت ڕۆبۆتەکان لەسەر بنەما ئاکارییەکان پرۆگرام بکرێن، ئاکار مەسەلەیەکی حیسابی نییە».

## کار بۆ پەرەپێدانیان دەکرێت

هەندێک ڕۆبۆت دروستکراون کە دەتوانن بەدواداچوون بۆ پێکهاتەکانی زەوی بکەن، و ڕێگە و ڕێڕەوی باشتر هەڵببژێرن، بگرە هەندێکیان توانای گەیاندنی کۆمەکی سەربازی وەک چەک و تەقەمەنی و پاککردنەوەی زەوی لە مینەکانیان هەیە و دەتوانن کاری پاسەوانی بکەن. تائێستاش کارەکان




بەردەوامن بۆ پەرەپێدانی ئەو ڕۆبۆتانە، تا بتوانن هەستی بەرکەوتن و بۆنکردن و گوێگرتن و چێژکردنیان هەبێت و بەشێوەیەکی باشتر و خێراتر کار و ئەرکەکانیان بەئەنجام بگەیەنن.
ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

خواستی وایە پەرە بە رۆبۆتێک بدات کە لە بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، شەڕ بکات و بتوانێت بەسەر بەربەستەکاندا سەربکەوێت و لە ئاودا مەلە بکات و چاودێری رۆبۆتە سەربازییەکانی تر بکات.

ئەمریکا رۆبۆتێکی سەربازی وەهای دروستکردووە کە لە شێوەی تۆپدایە و لەسەر زەوی هەڵبەز و دابەز دەکات و پاشان دەتوانێت لەسەر سێ پێی تلیسکۆبی رابوەستێت، و لە کونێکەوە کە بۆی دروست کراوە، سەری دەربهێنێت. و چاودێری شوێنەکە بکات بۆ دۆزینەوەی هێزەکانی دوژمن، هەست بە گەرمایی جوڵە بکات و لەرێی ئەو چەکانەی کە تێیدایە، بەشێوەیەکی خێرا دەستپێشخەری لە تەقەکردندا بکات.

هەروەها رۆبۆتێکی تری دروست کردووە کە لەگەڵ سروشتدا دەگونجێت، و بۆ تەقاندنەوەی مینە دەریاییەکان دەچێتە نێو قوڵایی ئۆقیانوسەکان.

زانایان لەئێستادا لە هەوڵی پەرەپێدانی سەربازێکدان کە لەشێوەی رۆبۆتێکی زۆر بچوکدایە و توانای خلیسکان و رێکردن و فرینی بەسەر کێڵگە مینرێژکراوەکاندا هەیە و دەتوانێت بە ئاسانی سیخوڕی بەسەر دوژمنەوە بکات و مینەکان رابماڵێت و چەکە کیمیاوییەکان ئاشکرا بکات.

هەروەها ئەمریکا رۆبۆتێکی میکرۆهەوایی بە قەبارەی مێشێک بەرهەمهێناوە کە لەلایەن پنتاگۆنەوە بۆ پەرەپێدانی، بڕی ٦٠ ملیۆن دۆلاری بۆ تەرخان کراوە.

ئەو مێشە دەتوانێت بەهۆی کامێراکانییەوە، چاودێری هێزەکانی دوژمن بکات و لەرێی ژەهر خستنە نێو ملیان، سەربازەکان راوبکات و بیانکوژێت.

# دە زگای تەندروستی پیشمەرگە یان نەخوشخانەکانی شورش

ئامادەکردنی: شنە محەمەد نەجات

هەر لەسەرەتای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەڕابەرایەتی (ی.ن.ك) کەشۆڕشێکی جەماوەری بوو، هەموو چین و توێژێك بۆ سەرخستنی ئەو شۆڕشە پاڵپشت و پشتیوان بوو ئەو توێژەی کەلێرەدا تیشکی دەخەینە سەر ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەشۆڕشەکەماندا ئەویش تەندروستیە.

کەبەدەیان دکتۆرو کارمەندی تەندروستی لەسەردەمی شۆڕشدا بۆ پشتیوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان خۆبەخشانە کۆڵە پشتەکەی دەرمان و چەکی شەڕەفیان کردە شان کەشان بەشانی پێشمەرگە درێژەیان بەخەباتدا.

لەوپێناو ئەوەشدا دەیان پزیشکو کارمەندی تەندروستی گیانیان بەخت کردو تائێستاش بەردەوامی بەخزمەتی پێشمەرگەو کەسوکاری شەهیدان و جەماوەر دەدەن و چەندین نەخۆشخانەمان بەناوی نەخۆشخانەکانی شۆڕشەوە هەیە بۆ ئەم مەبەستەش گۆڤارەکەمان درێژە بەچاوپێکەوتنەکانی دەدات لەگەڵ ئەو گیان بەخشانەی کە لەئێستاو ڕابردوودا خزمەتی پێشمەرگەو جەماوەریان کردوە، بەخۆشحاڵیەوە لەم ژمارەیەدا چاومان کەوت بە بەڕێز (یوسف محەمەد عەزیز) ناسراو بە (دکتۆر شوان) کەیەکێکە لەپزیشکەکانی سەردەمی شاخ و مێژوویەکی پرشنگداری لەسەر خستنی شۆڕشدا هەیە. بەم شێوەیە باسی نەخۆشخانەکانی شۆڕشی لەسەردەمی شاخدا بۆ کردین.



لەساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیم بە شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە کرد لە نەخۆشخانەی قوڵە هەرمێ لەناوزەنگ لە ناوچەی قەڵادزێ لەرێگای خوا لێخۆشبوو شەهید محەمەد سوڵتان.

سەرەتا نەخۆشخانەکە لەچەند ژوورێک پێک هاتبوو کە دکتۆری ددانی لێ بوو ئەویش دکتۆر سەردار تاڵەبانی کە دەرچووی کۆلێژی پزیشکی ددان بوو هەروەها ئامێری تیشکی لێبوو کە ئەوکات کارێکی زۆر گرنگ بوو.

کاک بەیان کاری لەسەر ئامێری تیشکەکە ئەکرد و هەموو کارەکانی کارەبایی لەنەخۆشخانە رێک دەخست.

ئەوکات د. فائق مەسوؤلی نەخۆشخانە بوو لە نەخۆشخانە تەنها کاری سەرەتایی ئەکرا بۆ پ.م و هاوڵاتیان کە لەناوچەکە بوون.

من کە هاتمە نەخۆشخانە ئەو کارانەم بەکەم ئەزانی بۆ کەسێکی خەریجی کۆلێژی پزیشکی بێت کە خۆم هەر لەسەرەتاوە ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی پەیوەندی بە شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە بکەم.

هەر کە موقیم بووم لەسلێمانی زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ جەراح و ژوری عەمەلیات ئەبردە سەر پەیوەندی زۆر چاکم دروست کرد لەگەڵ جەراحەکان کە ئەوکات بەرێز دکتۆر نەوزاد عطاری لێ بوو و بەمامۆستای خۆم و دکتۆرێکی نمونەیم دەزانی کارەکانیم زۆر بەدڵ بوو ئەویش زۆر یارمەتی دام بۆ ئەوەی زۆر باش فێری عەمەلیات ببم.

جگە لەدکتۆری جەراح ستافی

ئەو دەنگ و باسانە بڵاو بویەوە کە لە قولە هەرمێ نەشتەرگەری دەکرێت. بەڕێزان مام جەلال و کاک نەوشیروان ملازم عومەر هەواڵەکانیان پێ زانی و زۆر پاڵپشتی منیان کرد بە ئەنجامدان و پەرە پێدانی کاری پزیشکی لە ناو ی.ن.ک.

نەخۆشخانە زۆر گرنگ بوو بۆ ئەوەی عەمەلیات بکەم بۆیە پەیوەندی زۆر چاکم لەگەڵ ئەوانیش دروست کرد بەتایبەتی ستافی تەخدیر و ستافی ژووری عەمەلیات.
بۆیە کەهاتمە نەخۆشخانەی قولە هەرمێ کاری نەخۆشخانە بەکەمم ئەزانی بۆ خۆم و ئەمووت ئەمە تەنها کاری کادری پزیشکی یە وەک معاون طوبی نەک وەک دکتۆر هەر لەسەرەتاوە هەوڵم دا کاری پزیشکی پەرە پێبدەم و دەمویست ئەو ئەزموونەی لە سلێمانی لە ژووری نەشتەرگەری فێربووم لە لادێ جێ بەجێی بکەم .
پرسیارم دەکرد بۆ نەشتەرگەری لێرە ناکەن کە دکتۆریشی لێ بوو ئەوان وەڵامیان ئەوە بوو کە ئەو کارە لێرە ناکرێت و زۆر شتی پێویستە وەک ئامێری تخدیر و کادری تەخدیر و ژووری نەشتەرگەری.
من لەسلێمانی فێری نەشتەرگەری کردن بووم کارەکانیم بە باشی دەزانی.
هەوڵمدا نەشتەرگەری لە نەخۆشخانەی قولە هەرمێ بکەم کە پێشیان نەدەکرا بۆیە پەیوەندیم بە بەڕێز شەهید مامۆستا جەمال تاهیرەوە کرد و داوام لێ کرد یارمەتیم بدات و ئەو زۆری پێ خۆش بوو وەڵامی دامەوە کە هەر کارێک پێویست بوو بۆ منی ئەنجام دەدات.
مامۆستا شەهید جەمال تاهیر مەسؤلی ڕێکخستنەکانی ی.ن.ک بوو پەیوەندی زۆر باشی هەبوو لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ناو شار بەتایبەتی سلێمانی کە من لەوێ

کارم دەکـــرد.

داوام لـــێ کـــرد هەندێـک کـــەل و پەلـــی پزیشـــکی و دەرمانـــی تایبـــەت بـــە نەشـــتەرگەریم لەسلێمانی بۆ دابین بکات و ئـەو زۆر بەخۆشحاڵیەوە بە تەنها چەن ڕۆژێک هەمـــوو ئـەو کـەل و پەلـەی کـە پێویست بوو بـۆی دابیـن کردین لەوانـەش دەرزی کیتامیـــن کـــە تەنهـــا بـــەو دەرزییـــە ئەتوانـم نەشـتەرگەری ئەنجام بدەم بەبێ ئـەوەی ئامێری تەخدیریـان هەبێت. دەستم کـــرد بـــە ئەنجامدانـــی نەشـــتەرگەری لـــە نەخۆشـــخانەی قولـــە هەرمـــێ یەکـــەم جـار دەسـتم کـرد بـه قـاچ بڕینـەوە کەتەنهـا بـەدەرزی کیتامیـن ئەکـرا و یـەک کەسـیش یارمەتی منـی ئـەدا لەئەنجامدانی ئەویش پ.م نـاوی عەلـی مینـا بـوو ئـەو کەسـە خووێنـی ئەدیـت نەدەبورایـەوە.

چەندین سـەجی شـکاندنی ڕانم بـه درێل ئەنجـام ئـەدا کـە ئـەو کات کاک بەیـان درێلـی بـۆ مـن ئامـادە ئەکـرد و تەعقیمـی ئەکـرد و منیـش بـە درێلـی ئاسـایی کارەکـەم بەچاکـی ئەنجـام ئـەدا.

چەندیـن جیسـت پێـوم ئەنجـام ئـەدا بەشـێوەیەکی بـاش کـە بـە ضمامێکـی تایبەتـم ئەنجـام دەدا کـە خـۆم داهێنانـم بـۆ کـرد کەبـە دانانـی جەسـت تیـوب تەنها بەضمامەکـە خوێنـم سـەحب دەکـرد لەنـاو سـنگ و هەروەهـا بـەو ضمامـەش خوێنـم ئەبـردە دەرەوە.

ئـەو دەنـگ و باسـانە بـڵاو بویـەوە کـە لـە قولـە هەرمـێ نەشـتەرگەری دەکرێـت.

بەڕێـزان مـام جـەلال و کاک نەوشـیروان مـلازم عومـەر هەواڵەکانیـان پـێ زانـی و زۆر پاڵپشـتی منیـان کـرد بـە ئەنجامـدان و پـەرە پێدانـی کاری پزیشـکی لـە نـاو ی.ن.ک. مەڵبەنـدەکان دانـران و تیپـەکان دابـەش کـران بەڕێـز دکتـۆر فائـق بـوو بـە مەڵبەنـدی دوو لـە سـەرگەڵو و دکتـۆر شـالاو بـۆ دۆڵـی سـەرکەپکان و دکتـۆر زریـان بـۆ مەڵبەنـدی سـێ منمامـەوە لەسـەرکردایەتی و لـەوێ کارپزیشـکیم بەڕێـوە دەبـرد.

بەڕێـز مـام جـەلال مقـەڕی خـۆی لەپڵـگان دامەزرانـد ئێمـەش لای دێـی سـەرکەپکان.

مـام جـەلال منـی ڕاسـپارد بـۆ ئـەوەی نەخۆشـخانەیەک دروسـت بکـەم لـەو دۆڵەو منیـش جێگایەکـم هەڵبـژارد لەسـەر ڕوبـار و لەنـاو دۆڵێـک و دەسـتمان کـرد بەدروسـت کردنـی و زۆر پێـوەی مانـدو بوویـن بـەلام پێـش ئـەوەی لەنەخۆشـخانە دەوام بکەیـن مفاوضـات دەسـتی پـێ کـرد و کاک نەوشـیروان ووتـی وەرە بـڕۆ بـۆ سـورداش ئـەو نەخۆشـخانەیە بەجـێ بهێڵـە مـن زۆرم پـێ ناخـۆش بـوو بـەلام ووتـی دەبێـت بەجێـی بهێڵیـت و بـڕۆی بـۆ سـورداش.

مـام جـەلال پێـی زانـی کەمـن مفاوضاتـم پـێ خـۆش نەبـوو بۆیـە ڕۆژێـک بانگـی کـردم و لـە ئـاوزی بـە تەنیـا پیاسـەمان دەکـرد لەسـەریان پێـی ووتـم بیسـتومە کـە مفاوضتـت پـێ خـۆش نیـە ووتـم بەڵـێ و ئـەو وەلامـی داوە و ووتـی مـن زانیومـە تـۆ

پیاوێکی ڕیاضیت و هیوایەتی ڕیاضەت هەیە گوتم بەڵێ ووتی ئەگەر یەکێکی ڕیاضی ماندوبێت پێویستی بە چی هەیە وتم ئیسراحەت و ئەویش وەڵامی دامەوە ووتی ئێمەش هەر وائەکەین و ئەگەر کارەکەمان بەدڵ نەبوو واز دەهێنین وەهەروەها وتی ئەی تۆ بەمنت نەدەوت کە ئێمە پێویستمان بە تەجهیزەی تەخدیر و عەمەلیات هەیە بۆ ئەوەی کارەکانمان بە چاکی ئەنجام بدەین بۆیە ئەمەش دەرفەتێکە بۆئەوەی ئەم کارانەش ئەنجام بدەین و بزانە چی کەم و کوڕی هەیە پڕی بکەرەوە و سود لەم دەرفەتە وەر بگرە.

بۆیە من تەرکیزم لەسەر ئەمە کرد کە تەنها سود لەم دەرفەتە وەربگرم.

کە چووم بۆ سورداش لەنەخۆشخانە دکتۆر شالاوی لێ بوو نەخۆشخانەیەکی زۆر باش بوو بە ژوری نەشتەرگەری و تاقیگە و تیشک وەهەروەها ژوری دکتۆری دان کە بە فەرمانی تایبەت دروست کرا لە مجلس قیادة الثورە.

هەروەکو پێشان باسم کرد پەیوەندییەکی باشم هەبوو لەگەڵ دکتۆرەکانی سلێمانی ستافی پزیشکی و هەموو هەفتەیەک دکتۆری پسپۆڕ لەسلێمانیەوە دەهاتنە سورداش بۆبینینی نەخۆش.

دکتۆر نەوزاد عطاریش ڕۆژێک هاتە سورداش و چاوی بەمن کەوت ووتی تۆ وەرە بۆ سلێمانی لەژوری عەمەلیات دەوام بکە و دەورەی جراحە لەسلێمانی ببینە و ئێمەش یارمەتی ئەدەین.

بۆیە من و کاک خالد و کاک ئەنوەر و کاک نەوزاد چووین بۆ سلێمانی بۆ دەورەی عەمەلیات و تەخدیر و ژوری عەمەلیات.

سودی زۆرمان وەرگرت لەو دەورەیە بەهەمووومانەوە. لەمفاوضات ی.ن.ک ئیدارەی گشتی هەبوو دکتۆر خەسرەوخاڵ لێپرسراوی ئیدارەی گشتی بوو وەک ئەندامی م.س.

ڕۆژێک دکتۆر خەسرەوخاڵ بانگی کردم لە سیروان وتی ئێمە ئیدارەی گشتیمان داناوە لەناو ی.ن.ک و من سەرپەرشتی ئیدارەکە دەکەم و بەشی تەندروستی بەشێکە لەو ئیدارەیە و ئێمەش بڕیارمان داوە کە تۆ ببیت بە مەسؤلی بەشی ترندروستی لە ئیدارەکەدا و منیش بە خۆشحاڵیەوە وەرمگرت.

هەوڵم دا بەشی تەندروستی لەناو ی.ن.ک ڕێک بخەم و ناوم لێ نا دەزگای تەندروستی کوردستان **(KHF)**.

مفاوضات کۆتایی هات و نەخۆشخانەی سورداش هەموو ئامێرێکی پزیشکی تێدا بوو بۆیە هەوڵم دا نەخۆشخانەکە بگوێزمەوە بۆ مەرگە سیروان ئاگاداری بەڕێز مام جەلالم کرد و ئەو هەموو کار ئاسانیەکی بۆکردم و لەگەڵ پێشمەرگەکانی خۆی و ئۆتۆمبێلەکانی خۆی زۆربەی ئامێر و دەرمان و کەلوپەلی پێویست گواستمانەوە بۆ سیروان لە

ناوچـەی مەرگـە لـە جهـازی تەخدیـر و ئـەدەوات عەمەلیـات و ئـەدەوات مختەبـەر و ئەشـیعە و هەمـوو ئەدەواتـی زەروری و دوای ئـەوە گواسـتمانەوە بـۆ نەخۆشـخانەی بەرگەڵـو کـە بینایەکـی بـاش لەوێ دروسـت کرابوو.لـەدووای تەواوبوونـی مفاوەزات شـەڕی زۆرچـاک کـراو چالاکـی (ی.ن.ک.)زۆر فـراوان بـوو ژوری عملیاتـی تـەواو لـە بەرگەڵـو دانـرا وەک ئـەوەی لـە سـلێمانی وهەرئەوجهـازی ئەشـیعەو مختەبـەرو ژووری دکتـۆری ددان و ژورەکـە کـە بوناوەندێکـی گرنـگ و ناسـراو لـە ناوچەکـە هەوڵمـدا هەمـوو مەڵبەندێک پزیشـکێکی لێبێت و لـە هەمـوو جێیـەک کادری پزیشـکی لـێ بێت لـە معـاون طبـی. نـاوی هەموودکتـۆرەکان وکادری پزیشـکی لای خـۆم تۆمـار کـرد کـە ئـەوکات نزیکـەی ٢٠ دکتـۆری پزیشـکی لـە گـەڵ ١٠٠ کادری پزیشـکی لـە معـاون طبـی و مختەبـەر هەبـوو .هەموومانـگ معاشـمان بـۆ ئەوانـە دابیـن ئەکـرد بەجـۆرەی ئمـکان بـات کـە ڕێکخسـتن دەورێکـی زۆر بـاڵای هەبـوو. کارەکانمـان زۆر گـەورەبـوو کاری گرنگمـان ئەنجـام دەدا وخزمەتی پزیشـکی پێشـکەش بـە (پ.م)و هاووڵاتیانـی ناوچـەکان دەکـرد بـە بـێ جیـاوازی .

بەڕێزدکتـۆر کەمـال فوئـاد ئـاگاداری کاری ئێمـە بـوو و ڕۆژێـک لەگەڵ خۆی داینشـاندین و هەندێـک کاری پزیشـکی بۆمانـی بـاس کرد لـە منظماتـی غێـر حکومـی کـە لـە خـارج ئەنجـام ئەدرێـت و هەیـە و ئەوپێشـنیاری



کـرد کـە ئێمـە ئـەو هەمـوو دکتـۆرو کادری پزیشـکی و کاری پزیشـکی ئەکەیـن لـە گونـدەکان ئەمـە کاری منظەماتـی غێـر حکومیـە بۆیـە پێشـنیاری کـرد کـە ڕێکخـراوی ناحکومـی دروسـت بکەیـن هەرلـەو کادرانـە کـە کاری پزیشـکی ئەکەن لـە گونـدولادێ نـاوی هەموودکتـۆرەکان وکادری پزیشـکی وئەنجومەنـی گونـدەکان و ئـەوەی پێویسـت بووتۆمـار کـرا بۆئـەوەی ڕێکخراوێکـی ناحکومـی دروسـت بکەیـن و ناومـان لـێ نـا (Kurdistan Relief As-sociation "KRA") بەکـوردی کۆمەڵـەی فریاکەوتنـی کوردسـتان لـە ڕێگـەی دکتـۆر کەمـال فوئـادەوە ئەوەمـان بـڵاو کـردەوە و پەیوەنـدی لـە گـەڵ خـارج مـان کـرد لەگـەڵ صلیـب ئەحمـری ئەڵمانـی و سـوری و وڵاتانـی ئەوروپـی و هەروەهـا لـە گـەڵ منظماتـی غێـر حکومـی ئەوروپـی و لەوانـەش (Medico International) کـە

دەورێکــی بــاڵای هەیــە لــە یارمەتــی دانــی ئێمــە لــە هــاوکاری پزیشــکی ومــرۆی دەنــگ وباســی ئێمــە بڵاوبویــەوە کــە ئێمــە تەنهــا ڕێکخراویــن کــە ناحکومیــن لــە کوردســتان کاردەکەیــن و لەوڕێگایــەوە یارمەتــی پزیشــکی و مــرۆی بــە شــێوەیەک بــە ئێمــە ئــە گەیشــت ڕێکخــراوەکان هەوڵیــان دەدا پەیوەنــدی لەگــەڵ ئێمــە ببەســتن بــۆ هــاوکاری کردنــی خەڵکــی کوردســتان لــێ قەومــاوان لــە ۆردوگاو سەرســنورو گونــدەکان هــاوکاری پزیشــکی زۆرو هەروەهــا هــاوکاری مــرۆی لــە ڕێکخــراوەکان بەدەســت ئێمــە گەیشــت چالاکیەکانــی (ی.ن.ک) زۆر پــەرەی ســەندو گەیشــتە ئــەوەی چەنــد داســتان تۆمــار بکرێــت لەوانــە داســتانی دابــان و گرتنــی ناحیــەو کۆنترۆڵکردنــی چەنــد ناوچــەی گــەورە وناوچەکانــی ژێــر کۆنترۆڵــی (ی.ن.ک)زۆر فــراوان بووحکومەتــی بعــث ئــاگاداری کاری پزیشــکی ئێمەبــوو لــە نەخۆشــخانەی بەرگەڵــوو بەردەوام قەســفی ئەکردیــن بەتۆپــو تەیــارەو گەیشــتە ئــەوای ڕۆژێــک قەســفی کیمیــاوی کــرد بەتایبەتــی



نەخۆشــخانەی بەرگەڵــوو.

کاری پزیشــکی زۆر پــەرەی ســەند گەیشــتە ئــەوەی لــە مەڵبەنــد نــەک یــەک دکتــۆر بەڵکــو زیاتــر لــە دکتۆرێکــی لێبێــت و ورەی (پ.م)زۆرباــش بــە بونــی کادری پزیشــکی لەگــەڵ چالاکــی زۆر بــاش و جــەرگ بــڕ لــە نظامــی بعــث درا حکومەتــی بعــث هەوڵــی دا بەهەمــوو جۆرێــک و هەمووچەکێــک لەبەردەســت دژی (ی.ن.ک)وئەوەبــوو هە ندێک (پ.م)شــەهید بــوون بــە ژەهــری زرنیــخ لــە گەرمیــان و گەیشــتە ئــەوەی لای ئێمــە لــە منظەمــەی ســیروان ڕۆژی ١٩٨٧/١١/٢٤مــن و چەنــد پ.م لەماڵــی :ا: مصطفــی چــاوڕەش لــە گونــدی ســیروان ژەهــر خــوارد کرایــن بــە ژەهــری ثالیــوم کــە نظامــی بعــث زۆر جــار بــەکاری هێنابــو بۆلەناوبردنــی نەیارەکانــی و ئەوەبــو لەوڕۆژەدایکــی کاک مصطفــی چــاوڕەش و کچێکــی مــەلای مەرگــە و پ.م (ی.ن.ک)کاک بێســتون شــەهید بــوون بــە ژەهــری ثالیــوم مــن وکاک مصطفــی وکا: عدنــان مفتــی و دکتــۆر عثمــان محمــود وچەندیــن پ.م دیکــە ژەهــر خــوارد کرابویــن ئــەوکارەش بڵاوبویــەوە امنیســتی انتــر ناســیۆناڵ تداخلــی کــردو هەندێــک لەبــرادەران بــران بــۆ خــارج بــۆ عــلاج و منیش چــوم بــۆ پاریــس دوای ئــەوەی ئەنفال دەســتی پێکــرد زۆربــەی مقــەرات چــۆڵ کــران وچوینــە ســەر ســنوور لەگــەڵ ئێــران و زۆر خەڵکــی گونــدەکان بــران بــۆ ۆردوگاکان لــە نزیــک ســەردەشــت ڕێکخراوەکانــی ناحکومــی

جیهــان دەســتیان کــرد بــە هــاوکاری کــردن لەرێــگای (KRA) وە بــە هەمــوو جۆرێــک لــە هــاوکاری پزیشــکی و خــواردن و هــاوکاری تــر لــە ئێــران رێکخــراوی (KRA)لەســەر بریــاری بەریــز مــام جــەلال کرابــە جەبهەیــو هەمــوو حزبەکانــی کوردســتان کــران بــە ئەنــدام لــەو رکخــراوە ومــن لێــی رازی نەبــوم ئەوەبــو دکتــۆر هەڵــۆ کــرا بــە مەســئولی (KRA) مــن هــەرکاری خــۆم دەکــرد تەنها بــۆ(ی.ن.ک) بەنــاوی دەزگــای تەندروســی کوردســتان لەنــاو (ی.ن.ک.)دوای ئــەوەی چوویــن بــۆ ســەرســنور لــە ئێــران بەرێــز مــام جــەلال منــی راســپارد بــۆ ئــەوەی نەخۆشــخانەیەک لــە ســەرســنور دروســت بکــەم لــە منتیقــەی قاســمە ڕەش و نــۆکان ئەوەبــو مــن لــە نــۆکان جێگایــەک هەڵبــژارد لەســەر ســنوری عێــراق ئێــران لەنزیــک رووباردەســتمان بــەکار کــردەوە لــە نەخۆشــخانەی نــۆکان و رێکخــراوەکان زۆر هــاوکاری پزیشــکی و مرۆییــان گەیانــدە ئێمــە لــە ســەرســنور (ی.ن.ک)خــۆی رێکخســتەوە هەندێــک مەڵبەنــد دادەنرانــەوە هەنێــک پ.م ئامادەکــران وبــۆ ئــەوەی بچنــە خــوارەوە وەک پ .م پارتیــزان وئێمــە بــۆ هەموویــان دەورەی پزیشــکیمان کــردەوە ئامادەکــران بۆئــەوەی بــە هەندێــک کاری هەســتن ئەگــەر پێویســت بــوو

دەنگــۆی آنتیفاضــە هاتــە کایــەوە (ی.ن.ک) خــۆی ئامادەکــرد بــۆ ئەنجامدانــی و ئــەوە بــووکاک نەوشــیروان ئــاگاداری کــردم کــە خۆمــان ئامادەبکەیــن وەک بەشــی تەندروســتی و ئامادەکــردی دەرمــان و کــەل وپەلــی پێوەســت بــۆ کادری پزیشــکی .هەمــووکادرەکان دابــەش کــران و خــۆم لەگــەڵ بەرێــز نەوشــیروان ئامادەکــرد تاکــو آنتیفضــە دەســت پــێ بــکات و ئێمــە هاتینــە خــوارەوە لــە گــەڵ کاک نەوشــیروان لــە رێــگای قاســمە ڕەش نــۆکان و یەکــەم شــار کــە چاومــان پــێ کــەوت شــاری قەڵادزێــو دوای ئــەو ڕانیــە تاکــو کەرکــوک رزگار کــرا پێکــەوە بویــن و کــە تــەواو بــوو بــۆ ئیســراحەت چویــن بــۆ شــاری ســلێمانی

ناوی پزیشکەکانی ناو (ی.ن.ک)

١-د. شوان
٢-د.خدر
٣-د.سەردار
٤-د.شالاو
٥-د.زریان
٦-د.فائق
٧-د.هەڵۆ
٨-د.هەفاڵ
٩-د.حسن
١٠-د.دڵشاد
١١-د.جبار
١٢-د.محمد آمین
١٣-د.ئازاد
١٤-د.حسێن
١٥-د.جلال
١٦-د.ناصح
١٧-د.هێرش



ئا/ئاودێر بەرزان حاجی ئیبراهیم

# بەهێزترین دەزگای هەواڵگری موساد

بەتارمایی جیهان باوکی دەزگا هەواڵگرییەکان ناوی دەنێن بەهێزترین کاری گەورەترین دەزگای هەواڵگری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دووەم گەورەترین دەزگای هەواڵگری جیهانە لەدوای (CIA) ئەمەریکی وە کەمترین زانیاری لەسەری هەیەو چەندین کاری شاراوەی کردوە و ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە ئاسایشی وڵاتی خۆی و بەشێکی وڵاتانی ئەم ناوچەیە ئەویش دەزگای هەواڵگری موسادە.

لەساڵی 2021 (داڤیو بەنیاع) سەرۆکی دەزگای هەواڵگری مۆسادە و ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل فەرمان وەر دەگرێ سەرۆکەکەشی دیاری دەکرێت بووجەی ساڵانەش لە نێوان 2بۆ3 ملیار دۆلار دایە گرنگترین دیارترین ئەرکەکانی چاودێری ڕێکەوتنەکانی وڵاتەکەیەتی لەگەڵ وڵاتانی دی

کەو ئەرکی لە پێشینەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی جولەکەیە لەسەرتاسەری جیهان کاری سیغوری بەسەر زۆرینەی وڵاتانی جیهانەوە دەکات و ئەگەر ئەو وڵاتانە دۆست یانەیاری ئیسرائیل بن ئەرکەکانی دیکەشی بەستنی پەیوەندی یە لەگەڵ سەرکردەو کەسایەتیە دیارەکانی جیهان و هاوکات هەوڵ ئەدات بۆ تێک شکاندنی ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەر وڵاتەکەیوو ئامانجیشی لاوازکردنی ئەو وڵاتانەیە کە ئیسرائیل بەنەیاری سەرسەختی خۆیان دەزانن.کارێکی تری دەزگای مۆساد: کۆکردنەوەو زانیاری هەواڵی تەواوی ڕۆژنامەو گۆڤارو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنە بەتایبەتی ئەوانەی کەپیوەستن بەجوولەکەوە.ئەنجام دانی سەرجەم چالاکیەکانی ئیسرائیلی لە دەرەوەی وڵات کاری مۆسادە. هاوکات بەدوای کۆتای هاتنی جەنگی جیهانی دووەم ئەم دەزگایە هەولی داوە بەتۆڵە

**بەشی زانیاریەکان: کاری ئەم بەشە کۆکردنەوەی زانیاری داتای وردە لەسەر ئەوکەسایەتی و شوێنانەی کە مۆساد دەیەوێ بە ئامانجیان بگەیەنێت پێش ئەنجام دانی هەر چالاکیەک بەشی زانیاریەکان شی کاری و لێکۆڵینەوەی زۆر ئەنجام دەدات و زانیاری تەواو بەدەست دەهێنێت**

سەندنەوە لەسەرجەم ئەو ئەفسەرو بەرپرسە بالآیانەی کەدەستیان هەبووە لە کوشتنی جولەکەکاندا پێک هاتەی دەزگای مۆسادبەم شێوازەیەو بەگشتی **8**بەشی هەیە .بەشی زانیاریەکان: کاری ئەم بەشە کۆکردنەوەی زانیاری داتای وردە لەسەر ئەوکەسایەتی و شوێنانەی کە مۆساد دەیەوێ بە ئامانجیان بگەیەنێت پێش ئەنجامدانی هەر چالاکیەک بەشی زانیاریەکان شی کاری و لێکۆڵینەوەی زۆر ئەنجام دەدات و زانیاری تەواو بەدەست دەهێنێت و بەشی چالاکیەکان: کاری ئەم بەشە دانانی پلان و دەزگیرکردن و بەئامانج کردنی ئەو کەسایەتیانەیە کە دەبنە هۆی زیان گەیاندن بەبەرژەوەندیەکانی ئیسرائیل.

جەنگی دەرونی: ئامانجی ئەم بەشە بڵاو بوونەوەی پروپاگەندەو هێرشی دەرونی یە بۆ سەر نەیارەکانی ئیسرائیل کە ئەوەش دەبێتە بڵاوبوونەوەی ترس و دڵەڕاوکێ یەکی زۆرو هەندێ جار بەبێ هیچ چالاکیەکی چەکداری و تەنها لەڕێگەی جەنگی دەرونی یەوە ئامانجەکەی دەپێکێت.

بەشی ئۆپراسۆنە تایبەتەکانی کەبەبێ سادە ناسراوە.

بەشی توێژینەوە: بەرپرسیارە لە راپۆرتی بارودۆخی ڕۆژانە پوختەی هەفتانە ڕاپۆرتی وردی مانگانە.

بەشـــی تەکنەلۆژیـــا: بەرپرســـیارە لــە پــەرە پێدانــی تەکنــە لــۆ ژیــا پێشــکەوتوەکان.

جگــە لــەم بەشــانە چەندیــن بەشــی تایبــەت بەپــەروەردەو پێگەیانــدن ئەتوانــم لەنــاو دەزگای مۆســادا کەبەشــێکیان بــۆ کاری دوور مــەوداو ئــەم دەزگایــە نزیکــەی 7هــەزار کــەس کاری تێــدا ئەنجــام دەدەن و چەندیــن دەســتە واژە بــەکار دەهێنــن بــۆ ئەوانــەی کاری تێدادەکــەن دیــار نیــن.

ماموون: بەڕێوبەری مۆساد.

کاســتا: کارمەنــدی مەیدانــی مۆســاد.

کیرۆن: کارمەندی کاری زۆر شاراوە.

خالاش:کارمەندی دەزگای لەلوبنان.

ســیانیم: بەوجولەکانــە دەوترێــت لــەدەرەوەی أیســرائیل دەژیــن.

ماکــوا: هەواڵگــری یەکــی مۆســادە کــە جولەکەنەبێــت.

دەزگا.

ئــەم گروپــە هەمــوو کارێــک دەکــەن لــە پێنــاو وڵاتەکەیانــدا نــەک لەپێنــاو هیــچ کــەس و لایەنێــک دا بۆیــە بەرژەوەندیەکانــی وڵاتەکەیــان لــە هەمووشــتێک لا گرنگتــرە.

ڕەنگــە چەندیــن شــاراوای ئــەم دەزگایــە هەبووبێــت بــە نهێنــی مابێتــەوە.



# مێدیتەیشنەکانی دیکارت

## هەڵهێنجانی چەمکی مەعریفەی خودا و خود ناسی

گۆران زیار شێخانی
مامۆستای بەشی ڕاگەیاندن لە پەیمانگا

بەشی یەکەم

وەک سەرەتایەک دەمەوێت کورتەیەک لەسەر چەمکی فەلسەفە بنووسم هەرچەندە زۆرێک ئاشنایەتیان هەیە لەگەڵی بەلام خوودی فەلسەفەناسی وا دەکات نووسەر جۆراو جۆر و پڕ مانا لەچەمکی فەلسەفە وردبێتەوە وەک چەمک وشەی فەلسەفە لە وشەکانی ( فیلۆ «سۆفۆس)ی یۆنانی وەرگیراوە، ئەگەر بەکوردی بکەین هاومانایەکی هەیە لەگەڵ (حیکمەت ناسی و خۆشەویستی بۆزانین و ورد بوونەوە لەراستی) دیوێکی تری باسەکە ئەوە کە کێن ئەوانەی کە دەکرێت وشەی فەیلەسووفیان بدەینەپاڵ گومان لەوەدانیە کە سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ و کانت و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ماجە و غەزالی و مەلا سەدرا و پۆڵ ریکۆر و ستانلی کافیل و پیتاگۆرس و دێکارت و جاک دریدا و مێشێل فۆکۆ جیۆرج گەدامیر لودڤیگ ڤتگنشتاین نیچە و شۆپنهاوەر و چەندانی تر فەیلەسووفی راستەقینەی سەردەمانی خۆیان بوون و هیچ دەمەتەقێ و قسەوباسێک هەڵناگرێت ، بەلام ئاساییە هەندێک لە بیریارانی تر کە تەواوی تواناکانیان لە چوارچێوەی زانستێکی دیاریکراوی سیاسی یان ئابووری یان سروشتی قەتیس بووە بە فەیلەسووف ناوزەند دەکرێن وەک هانا ئارەندت کە تیۆریارێکی سیاسی زیاتر نیە یاخوود یۆرگان هابرماس کە زیاتر تیۆریارێکی دەروونناسیە و بەلام بە فەیلەسووف ناوزەند دەکرێن هەرچەندە خۆیان مەرج نیە ویستیان لەسەر ئەم پێشگرە هەبێت.




لێرەدا ناوەرۆکی تەوەرکە سەرنج دان و وردبوونەوەیەکی زانستیە لە دید و ژیانی دیکارت کە فەیلەسووفی بەناوبانگی فەرەنسی دیکارت لەساڵانی 1596 لە وڵاتی فەرەنسا لەدایک بووە و لە ساڵی 1650 کۆچی دوایی کردوە بیرکارو شارەزای فیزیک و نووسەری فەرەنسایی بە باوکی فەلسەفەی نوێگەر ناوزەند دەکرێت زۆرێک لە بابەتەکانی دیکارت فەلسەفەیەکی ئارەزوومەندانەی فیزیکی فەلسەفین کە تەواوی بیرمەندانی لەسەر ئەوە کۆکردۆتەوە کە دیکارت بەوپەری لەخۆرادیتی خوێندنەوەی بۆشتەکان کردوە و کرۆکی هۆشیاریەکەشی وەک بەشێک لە کاریگەریەکانی فەیلەسووفی یۆنانی ئەرەستۆ دەبیندرێت هەروەها وەک بەشێک لە زیندوو کەرەوەی ستۆیسیزمی سەدەی شازدەیە کە بریتین لە ( رەوتێکی زیندووی خاوەن تایبەتمەندی دیاریکراون کە بۆماوەی پێنج سەدە بەردەوام بوون کرۆکی بیرمەندانی ئەم رەوتە پێیان وایە کە جگە لە عەقڵ هیچ دەسەڵاتێکی بەرزتر نیە لەمەوە دەگەینەوە ئەو راستیەی کە جیهان ئەوەیە کە عەقڵ بۆمان دەردەخات ) ئەمە وای لێکردوە کە تێروانینە ئاینیەکانیدا سوور بێت لەسەر تاک بوونی دەسەڵاتی خودا بۆ کردەوەی خولقاندن .

دیکارت شەش خولیای بنەڕەتی جیاکردۆتەوە کە بریتین لە سەرسوڕمان خۆشەویستی ڕق ئارەزوو خۆشی و دڵتەنگی کە پێی وایە هەموو ئەو خولیایانە دەتوانن ببن بە نموونەی پێکهاتەی ڕۆحێکی جیاواز و ڕەسەن هەروەها دەرخەری پەیوەندی نێوان خولیا و هەڵسوکەوت هەیە خولیا زۆر بەئاسانی دەتوانێت کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان بکات

دیکارت بەوە ناسراوە کە هەمیشە وتوویەتی : من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم ، دەربارەی گرنگی دەرکەوتن و زۆر باووبوونی ئەم وتەیە نوسەر و لۆژیکزانی بەناوبانگی بەریتانی بێرتراند ڕەسڵ پێی وایە سەرەتای گۆڕانکاری فەلسەفی لەبیرکردنەوەی دەستەییەوە بۆتاکگەرایی لەم وتەیەی دیکارتدا دەردەکەوێت پاشخانی ئەم گۆڕانکاریەش لەدەستەی فەیلەسووفانی تاکگەرایی یان مرۆڤپەرستی سەرچاوەی گرتووە، ڕەسڵ ئەم چەمکە دەگەڕێنێتەوە بۆڕێبازی تاکگەرایی کە ( هەڵوێستێکی فەلسەفی سیاسی لۆژیکیە کە پێداگرە لەسەر ڕەوشتی تاکە کەس و پشتگیری ئامانج و ویستی کەسەکان دەکات لەپشت بەستن بەخۆیان هەروەها جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەبێت بەرژەوەندیە کەسیەکان لەسەر و بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت بن ) کە پێیان وایە ( شورا هەڵەن و تاک ڕاست بن ) .
هەرچەندە لەبەرامبەر پرەنسیبی دەستەگەرایی هەیە کەلایەنی کەم لای بێرتراند لەفەلسەفەی یۆنانەوە هەر لە فەلسەفەی ئاینگەرایی و کۆمەڵگەرایی و پاشایەتی تا دەرکەوتنی پرۆتێستانیزم کە ( بریتین لە کۆمەڵەی مارتن لۆتەر کە لەدەر ئەنجامی چەوساندنەوەی زۆری کڵێسا تووشی خەڵک ببوو دروست بوون ) تاکوو

ئێستاش بەشێک لەبیرمەندانی تازە پێیان وایە کە فەلسەفەی تاکگەرایی و خوود جێگای ئاینەکانیان گرتۆتەوە .
دێکارت لە گوتاری میتۆدا هەوڵ دەدات بگاتەکۆمەڵێک بنەمای بنەڕەتی کە مرۆڤەکان دەتوانن بەبێ هیچ گومانێک وەک راستی بزانێت بۆ بەدەستهێنانی ئەمەش میتۆدێک بەکاردەهێنێت کە پێی دەوترێت گومانی هیپەربۆلیک یاخوود میتافیزیک کە هەندێک جار گوماناوی میتۆلۆژیا یان گومانی کارتێز ناودەبرێت هەر بیرۆکەیەک دەتوانێت گومانیان لەسەر بکرێت رەتدەکرێتەوە و دواتر دووبارە دایدەمەزرێننەوە بۆئەوەی ببێتە بناغەیەکی بەهێز بۆ پتەوکردنی زانیاری راستەقینە ، دیکارت بیرۆکەکانی لەسفرەوە بنات ناوە کە لە کتێبی ( مێدێتەیشنەکان لەسەر فەلسەفەی یەکەم) ئەمە بەتەلارسازی دەبەستێتەوە خاکی سەرەوە دەردێنێت بۆدروستکردنی بینا یان پێکهاتەی نوێ هەر ئەمەشە کە دیکارت لەو رووەوە پێی وایە بناغەخوازی ئەرستۆ ناتەواوە و شێوازی گومانەکەی بناغەخوازی بەرز دەکاتەوە دواتر دیکارت بەو ئەنجامە دەگات کە دەتوانێت دڵنیابێت لەوەی کەبوونی هەیە چونکە بیردەکاتەوە بەڵام بە چ فۆرمێک ؟ لەرێگەی بەکارهێنانی هەستەکانەوە هەست بەجەستەی خۆی دەکات ،بەڵام پێشتر ئەمانە جێی متمانە بوون بۆیە دیکارت دیاری دەکات کە تاکە زانینی گومانلێکراو ئەوەیە کە ئەو شتێکی بیرکەرەوەیە بیرکردنەوە ئەوەیە کە دەیکات و دەبێت دەسەڵاتی لەجەوهەرەکەیەوە هەبێت کە بیرکردنەوە بەم شێوەیە پێناسە دەکات : ئەوەی لەمندا روودەدات بەجۆرێک کە من یەکسەر ئاگاداری بم تائەو رادەیەی کە ئاگاداری بم ، دیکارت لە کتێبی سۆزەکانی رۆح کەلەساڵی 1649 بڵاوکراوەتەوە باسی ئەوە دەکات کە جەستەی مرۆڤ رۆحێکی ئاژەڵی تێدایە کە بەردەوام بەدەوری مێشک و ماسوولکەکاندا دەسورێتەوە کاریگەری هەیە لەسەر خولیای مرۆڤەکان لەبەر ئەوەیە دیکارت شەش خولیای بنەرەتی جیاکردۆتەوە کە بریتین لە سەرسوڕمان خۆشەویستی رق ئارەزوو خۆشی و دڵتەنگی کەپێی وایە هەموو ئەو خولیایانە دەتوانن ببن بە نموونەی پێکهاتەی رۆحێکی جیاواز و رەسەن هەروەها دەرخەری پەیوەندی نێوان خولیا و هەڵسووکەوت هەیە خولیا زۆر بەئاسانی دەتوانێت کاریگەری لەسەر هەڵسووکەوتی مرۆڤەکان بکات ئەوەش بە دەرکردنی رژێنێک لە مێشکەوە کە سەرچاوەکەی خولیایەک بێت ناوی ئەو رژێنەشی نا رژێنی پینێڵی .

هەروەها دیکارت تیۆرێکی لەسەر کاردانەوەی ئۆتۆماتیکی جەستەیی بەرامبەر بە ڕووداوە دەرەکییەکان پێشخست کە کاریگەری لەسەر تیۆری ڕەفلەکسی سەدەی نۆزدەهەم هەبووە کەپێی وابووە جوڵە دەرەکییەکان وەک دەست لێدان و دەنگ دەگەنە کۆتاییەکانی دەمارەکان و کاریگەری لەسەر ڕۆح هەیە کە نموونەی نزیک بوونەوەی دەست لەئاگر وەک سامپڵێکی زیندوو و خێرا باس دەکات ، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێی وابووە کە دەبێت ڕۆح بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستی ئەو تەحەدای بۆچوونی هاوچەرخەکانی کرد کە ڕۆح خودایە هەرچەندە نەیتوانیوە لەو ڕوانگەیەوە هەست بە جیاوازیەکانی نێوان ڕۆح و خودا بکات وەک زۆرێک لە بریارە فەلسەفیەکانی ئاینناسی وەلامیان هەبووە بۆ ئەم دەستەواژەیەی دیکارت چونکە ئەو وەک لایەنی تەواوکاری خوودی ڕۆح لە خودای ڕوانیوە گومانیش لەوەدانیە کە خالق مەبەست لێ خودایە دەبێت ڕاستەوانە پەیوەندیەکی هەبێت لەگەڵ ڕۆح چونکە ڕۆح کەمترین کەس ئەوانەن کە توانیویانە دەربارەی بدوێن هەم لە ڕووی تیۆریەوە وەک تیۆری و دوان لێی هەم وەک بە پراکتیزەکردن و تاقیکردنەوەی ڕۆح لەبەر ئەوەی دیکارت پێ وابووە کە ڕۆح دەتوانێت باش بێت ئەگەر خۆی بیەوێت بەپێچەوانەوە هەر ڕاستە بەومەرجەی کاریگەریە سروشتی و میتافیزیکیەکان فەرامۆش نەکرێن بەنموونە مرۆڤەکان ئەگەر ویستی شەرانگێزیان هەبێت سروشت و ئاژەڵەکانن پاڵنەری خراپەکان ، کەچی زیاد لەوە لە تیۆری ئیبن غەزەل و ئیبن سینا و فارابی ڕۆح تاکوو ئێستا بە پاکی ماوەتەوە لەبەر ئەوەی خوداوەند ڕۆحی مرۆڤەکانی سەرپشک کردوە کە باش بن یاخوود خراپ لەگەڵ ناردنی ڕێنامەی ژیان و ژیری کە لەلایەن پیاوانی ئاینی بەردەوام پەسەند دەکرێت .

ئەخلاق یاخوود ئاکار لای دیکارت زانستێکی هەرە بالا بووە کامڵ و پڕ بە پێز وەک باقی زانستەکانی تر ڕەگ و ریشەی لە بازنەی میتافیزیکدا هەیە هەمیشە لە شوێنی سروشت و مرۆڤەکانی کۆڵیوەتەوە بەرگری لە ئیرادەی ئازاد دەکات بۆنموونە دەڵێت : عەقڵ بەسە بۆئەوەی ببێت بەرێنمایی کاری کردەوەکانمان چونکە عەقڵێکی باش و ئاگادار توانای هەڵبژاردنی باش و زیاتری هەیە هەروەها عەقڵی باش پەیوەستە بەباری دەروونی مرۆڤەکان هەرلەبەر ئەوەشە کە پێی وایە فەلسەفەی ئەخلاقی تەواو دەبێت لێکۆڵینەوەی تەواوی کردبێت لە جەستە و هەڵسوکەوتەکانی ئەو سیفەتەشی

لــە كاتــی نووســینی نامــەكان بــۆ شــازادە ئەلیزابێســی بەروونــی هەســت پێدەكرێــت و دواتــر هەمــوو ئــەو نامانــە بــوون بــە لێكۆڵینەوەیــەك لەپرۆســە و كاردانــەوە دەروونیــە جەســتەیەكان لــە مرۆڤــدا .

خۆشــبەختانە دیــكارت لــە میدیتەیشــنی ســێهەم و پێنجەمــدا بەڵگەیەكــی دیــار دەخاتــە روو كــە بریتیەلــە هەبوونــی خودایەكــی میهرەبــان كــە ئــەو بــە خــودای خێرخــواز نــاوی دەبــات و دەڵێــت : لەبــەر ئــەوەی خودایەكــی خێرخــواز بوونــی هەیــە و عەقــڵ و سیســتمێكی هەســتیاری كاركــەری بــۆ دابیــن كــردووە و ئــارەزووی فریودانــی نیــە كەواتــە بــاوەڕی بــەو حســابە هەیــە كەواقعیــە و هەســتەكانی بــۆی دابین دەكــەن بەهەمــان شــێوە دیــكارت بانگــەوازی بنەمــای گونجــاوی هۆكارەكانــی خــۆی دەكات بۆپشــتگیری كــردن لــە ئارگیومێنتــی نیشــانە بازرگانیــەكان بــۆ هەبوونــی خــودا لەبەرگریكردنــدا لوكریتیــۆس دەهێنێتــەوە كــە بەمانــای ( هیــچ شــتێك لــە هیچــەوە نایــەت) كــە گوزارشــتە لــە بیرۆكــەی ئێمــە لــە كامڵبــوون پەیوەنــدی بەســەرچاوە تەواوەكەیــەوە هەیــە كــە بوونــی (خودا)یــە لەكۆتایــی میدیتەیشــنی پێنجەمــدا دووبــارە بــە ئارگۆمێنتــی ئەنتۆلــۆژی دەیســەلمێنێت كــە بوونەوەرێــك كەتــەواو و بێكۆتایــی باڵایە دامــەزراوە و پێشــنیاری ئــەوە دەكات كــە لــە

هەمــوو ئــەو بیرۆكانــەی كــە لەمنــدا هەیــە بریتیەلــەوەی كــە خــودا راســترینە هەروەهــا روونترینــە و هەروەهــا جیاوازترین ، بەڵگــەڵ بۆئــەوە ئەوەیــە كــە دیكارت هەمیشــە خۆی بــە كاســۆلیكێكی دڵســۆز زانیــوە و یەكێــك لــە ئامانجەكانــی مێدیتەیشــنەكانی بریتــی بــوون لــە بەرگریكــردن لــە ئایــن هەوڵــدان بــۆ زەمینەســازی بــۆ پەیرەوانــی ئاینــی ئاســمانی هــەر چەنــدە رەخنــەی جــدی لێدەگیرێــت دەربــارەی ئــەوەی ویســتوویەتی هاوپیشــەكانی دووربخاتــەوە لــە خــودا چونكــە ئەوەتــا باســكاڵ دەربــارەی دەڵێــت : دیــكارت عەقڵانیەكــی میكانیســتە و ناتوانــم لــە دیــكارت خــۆش ببــم بەهەمــوو فەلســەفەكەیەوە دیــكار هەمــوو هەوڵێكــی دەدا تاوەكــوو لــە خــودا دوورم بخاتــەوە، بــەڵام دیــكارت نەیتوانــی خــۆی لەپاڵنانــی خــودا بپارێزێــت و ببێــت بــە خــودا نەنــاس بۆئــەوەی جیهــان بخاتــە جووڵەیەكــەوە كــە جیهــان سروشــتێكی دوور لەخودایــەو هێــزی خــودا دوورە لــە گۆڕانكاریــە خوداییــەكان .

بەشی پانزەیەم



سەربەست بالخی

# سەربازە ونەکان

لەدەیەی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا ڕەوشی سیاسی عێراق و کوردستان وای کرد هەزارەها گەنج وتازە پێگەیشتووی وڵات لەرێڕەوی ئاسایی ژیان لایاندا و پەرتەوازەی ژیانی ناهەمواری بوون، منیش ئەوکاتەو لەتەمەنێکی کەمەوە بووم بە پێشمەرگە و تێکەڵی شۆڕشی چەکداری بووم لەریزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا،بەبێ ئەوەی بەدەست خۆم بێت بووم بەکارەکتەر و بەشداربووی دەیان شەڕی سەخت و خویناوی، دەیان کارەسات و چرکەساتی مەترسیدارم بینی،ئەوەی کەمنی پێشمەرگەیەکی سادەی کەم تەمەن بینیومە و تیایدا ژیاوم ڕەنگە لەناو کتێب و بیرەوەریەکانی لێپرسراوانی ئەوی ڕۆژی باس نەکرابێت و چوبێتە خانەی فەرامۆشیەوە . بۆیە بڕیارمدا ئەورۆژگارە سەخت و ڕۆژە خویناویانە بهێنمەوە یادی خۆم و بەبێ زیادکردن و وەك خۆی بیاننوسم.کەئەوەش بەشێکە لەمێژووی ئەم گەلە.

ئەرکمان لە شەڕەکانی سنوری مەڵبەندی سێ لەسەر شاخەکانی گەرووی مەنجەڵ و کاروخ درێژەی کێشا. وێڕای ئەوە ڕۆژانە دووربەدوور یەکترمان ئاگرباران دەکرد و چەندان جار هەوڵیاندا شاخەکان بگرن. بەڵام بۆیان نەکرا و پاش هەندێک شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە ئەکشانەوە و ئەوکەوتینە دوورەتەقە و بۆمباران. هێزەکانی دووژمن بەبازنەیەکی فراوان چواردەورەی شەڕگەکانی ئەو سنورەیان گرتبوو. گەمارۆیەکی توندیان خستبووە سەر سنورەکە. ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ پێداویستییەکانمان لە کەمی دەدا. فەوجەکانی جاش ئەوانەی لە هاتنماندا هاوکارمان بوون. وا لێرەش هاوکارمانن بە تەقەمەنی و ئازوقە. ئەوان بەڕۆژ لەگەڵ سوپاکەی دووژمندابوون و بە شەویش کاروانی هاوکارییەکانیان بۆ ئێمە ڕەوانە دەکرد.

هەروەها زانیارییان لەبارەی جموجۆڵەکانی دووژمن ئەدا بەسەرکردایەتی و خەمیان ئەخواردین. بەڵام لەبەر ئەوەی هێزەکەی ئێمە زۆر و بەرەکانی شەڕ فراوان بوون. تواناکانی ئەوانیش سنورداربوون و فریاری هەموو شتێک نەدەکەوتن. ئازوقە تەنیا نان و شەکر و چاو و تەمامە و خەیاریان ئەنارد. بۆیە ئێمە ماوەیەک بە زۆری نان و چای شیرین یان تەماتە ژەمی خواردنەکانمان بوو. خواردنی گەرم زۆر کەم بوو. سەرچاوەی ئاومان کانییەک بوو لە باکووری خۆرئاوای گەرووی مەنجەڵ. لە دۆڵێکدا بوو. هەندێک دوور و لەبەر لولەی دەبابەکاندا بوو. وابزانم دەبابەیەکیان تایبەت دانابوو بۆ ئەو کانییە. لە تاریکی شەودا نەبوایە نەماندەتوانی لێی نزیک ببینەوە. شەوان یان بەیانیان پێش داهاتنی روناکی ئەچوین مەتارە و زەمزەمەکانمان ئەکردە گوێنییەوە و پڕمان ئەکرد و ئەگەڕاینەوە. دەبوو بەشی هەتا شەو بکاتەوە کە تەنیا بۆ خواردن و چالێنان بوو (تایبەت بەو کانییە لە گۆڤاری رێبەری پێشمەرگە ژمارە ٨ ساڵی ٢٠٠٨ بەشێک لە بیرەوەرییەکانم بڵاوکردەوە کە ئێستا نامەوێت بچمەوە سەری) دەم و چاوشتن بە ڕێکەوت بوو سابونمان هەر نەبوو. هیچ دارێکی لێنەبوو بەبەتانی سێبەرمان دروستکردبوو ئەوە شوێنی پشوومان بوو. ئێوارەیەک دوو هاوڕێ کە نۆرەی ئاوهێنانیان بوو مەتارە و زەمزەمەکانیان کۆئەکردەوە بچن بۆ ئاو. منیش بەدوای زەمزەمەیەکدا ئەگەڕام هەندێک ئاوی تیابێ و کەمێک ئاو بکەم بە دەم و چاومدا. بینیم زەمزەمەیەک لە پەنایەکدا دانراوە. دەستمدایە نیوە بوو

هەر خێرا سەرەکەیم کردەوە و دەستم پێشت و ویستم مشتێ ئاو بکەم بە دەم و چاومدا بۆنی ئارەق بڵاوبۆوە. منیش بەسەرسوڕمانەوە گوتم ئەرێ ئەو بۆنە چییە..؟.

لەپڕ هاوڕێ سۆرانم لێپەیدا بوو هاواری کرد ماڵت بەقوڕگیرێ ئەوە چیت کرد ئاخر بۆ دەستت دایە ئەو زەمزەمەیە دەست نەسرەوت. بە ڕووگیرییەوە گوتم ئێ ئاخر من چۆن بزانم لەم شاخە ئەم زەمزەمەیە ئارەقی تیایە لە جیاتی ئاو. ئارەقەکەت هاوڕێ سۆران ئاشکرا بوو.

هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین.

نزیکترین گوند و ئاوایی گوندی گوڵان بوو لێمان. لەسەر ڕێگەی هاتن و ڕۆیشتنمان بوو. خەڵکەکەی هاوکار و هاوسۆزی شۆڕش و پێشمەرگە بوون. هەمیشە بەدەنگمانەوە بوون. پاش ماوەیەک ئاشنایەتیمان لەگەڵ پەیداکردن و بۆ پێداویستییەکان هاتووچۆمان ئەکردن. کاتێک بۆ پشوودان لەسەر شاخ ئاهاتینەخوارەوە. ئەچوینە هەر ماڵێک ئەبوو بە خانەخوێ و خزمەتی زۆریان ئەکردین. نزیکەی دوو ساڵ دەبو کەسمان هەواڵمان لە کەسوکارمان نەبوو. لەوێ وردە وردە بەرێککەوتن لەگەڵ ماڵی خانەخوێ کەسێک ئەچوو بەدوای ماڵی کەسوکاری پێشمەرگەدا و بە نهێنی ئەیانهێنان و لێرە بە یەک شاد ئەبوین. من و هاوڕێیەکم کە ئێستا نازانم کێ بوو بوینە میوانی ماڵێک. پیاوی ماڵ جلێکی کوردی ڕێکوپێک و جامانەیەکی جوانی لەسەردابوو. باسەکانمان کردەوە و بە خۆشحاڵییەوە گوتی ئای بەسەرچاو بێ خەمبن. حەمە ئەنێرم کەسوکارتان بهێنێ بۆ ئێرە. پاش دوودڵی و ترس و ڕاڕاییەکی زۆر بڕیارماندا ناونیشان بدەینە کاکە حەمە و بچێ بۆ ماڵمان. من لەگەڵ ماڵی خۆمان نهێنییەکم هەبوو کە ئەویش یەک دێڕ نوسین بوو. ئەگەر ئەو دێڕەیان ببینیایە دەیانزانی ئەو کەسە جێگای متمانەیە. لەگەڵ ناونیشان ئەو دێڕەشم دایە و کاکە حەمە ڕۆیشت. بەڵام زۆر لە ترس و دڵەڕاوکێدا بووم تووشی شتێکی خراپ نەبم کە لەم سەردەمی ئەنفالەدا ڕژێم وەک هار بەدوای ماڵ و کەسوکاری پێشمەرگەدا ئەگەڕا. چاریش نەبوو ئەمە دوا دەرفەت بوو. ڕەنگە ئیتر دەرفەتێکی تر ڕێنەکەوێتەوە. هەر واش بوو دوای ئەوە تا ڕاپەڕین کەس هەواڵی لە کەسوکاری نەما. هەر ئەو ڕۆژە کە ئێمە چاوەڕوانیمان دەستپێکرد. کۆمەڵێک لە دایک و باوک و خوشک و برای پێشمەرگەمان بینی کە ئەهاتن

بـۆ گونـد و باوەشـیان ئەکـرد بـە کـوڕ و براکانیانـدا و بەحەسـرەتەوە یەکتریـان ماچ ئەکرد. ئـەم گونـدە جگـە لـەوەی بووە جێگـەی حەوانـەوە و پشـووی ڕێگـەی دوورمـان. بـووە جێگـەی بەیـەک گەیشـتن و بینینـەوەی پێشـمەرگە و کەسـوکاریان. لـە زۆر شـوێن گوێمـان لـە دەنگـی گریـان و پێکەنیـن و خۆشـحاڵی ئەبـوو. پێشـمەرگە بـە حەسـرەتەوە هەواڵـی کەسـوکار و خۆشەویسـتانیان ئەپرسـی. ئـەو کاتـە هەواڵـی گرتـن و ئیعـدام و ڕووخانـی ماڵـە پێشـمەرگە یـان خۆشـاردنەوە و ئـەم مـاڵ و ئـەو ماڵکردنـی کەسـوکاریان لەدەسـت ڕژێـم هەبـوو. بـەڵام لـەو کاتـەدا بینینـی یـەک کـەس لـە خێـزان خۆشـحاڵییەکی گـەورە بـوو. ئاهێکـی بـاش بـوو کـە بـە دڵـی هەمـوو پێشـمەرگەدا ئەهاتـەوە. بەیانـی لەگـەڵ هاوڕێکـەم لـەو شـوێنەی ئۆتۆمبێلەکانـی لێدەوەسـتا لـە چاوەڕوانیـدا ڕاوەسـتابوین. دوو سـاڵ زیاتـرە نـە کەسـمان بینیـوە نـە هەواڵمـان لەکـەس هەیـە. دوای نیـوەڕۆ جێبێـک کـە لـە شـارەوە هاتبـوو لـە نزیکمـان وەسـتا. هەمـوو هەسـت و سـەرنجمان چـووە سـەر جێبەکـە پـاش کەمێک کاکـە حەمـە دابـەزی بـەدوای ئەودا دایکـی هەردووکمـان دابەزین. بەکری براشـم دەرکـەوت. ئـەو برایـەم دوو سـاڵ لەخـۆم منداڵتـرە. لـەو کاتـەدا ئـەو خوێنـدکار بـوو. ئێمـە بەخێرایـی جوڵایـن ئـەو دوو دایکـەش کـە چاوییـان پێمـان کـەوت هەرچییەکیـان بەدەسـتەوە بـوو دایـان بەزەویـدا. بەحەسـرەتەوە باوەشـیان پیاکردیـن. باوەشـێک دوو سـاڵ زیاتـر بـوو چاوەڕێمـان بـوو. نەمئەزانـی دایکـم پێئەکەنـی یـان ئەگـری. بـەڵام بەدڵـی خـۆی ماچـی کـردم. بەکـری براشـم لەباوەش گـرت ئـەوم سـێ سـاڵ زیاتـر بـوو نەدیبـوو زۆر خۆشـحاڵ بـووم. بـەرەو ماڵـی کاک خدر ڕۆیشـتین کـە پێشـتر چوبوینـە ماڵەکـەی و یەکترمـان ناسـیبوو. لەبـەر قەرەباڵغـی نەچوینـەوە



ماڵەکەی دوێنێ. کاک بەکر و خێزانەکەی زۆر بەڕێز بوون. زۆر بەسۆز و میهرەبان بوون. وەک دایک و باوک خەمیان لێئەخواردین. ئەو شەوە لەم ماڵە ماینەوە. تا درەنگانی شەو قسەمان ئەکرد و هەواڵی ئەندامانی خێزان و کەسوکارم پرسی. باوکم کە ئەویش سەربازی هەڵاتوو بوو. ئەیانگوت کۆڵانە و کۆڵان هاتووچۆ ئەکات و بە نهێنی کرێکاری ئەکات. هیچ شەوێک لەخۆمان دڵنیانین هەر جارێک لەدەرگا بدرێ هەموو دڵمان دائەچڵەکێ وائەزانین بەعسییەکان هاتوونەتە سەرمان چەند جارێک ڕایانکردووە و لە ماڵە خزمان خۆیان شاردۆتەوە. دابینکردنی بژێوی ژیانیان ئەو ڕۆژ ڕۆژ کرێکارییەیە کە باوکم بە فیراری ئەیکات. ئەوەش ژیانی زۆرینەی خەڵکی کوردستان بوو. ئەگەر جاشایەتی و پیاوخراپیت بۆ دووژمن نەکردایە.

کە شەو داهات جێگایان بەڕێزەوە بۆداخستین دوای ساڵانێکی دابڕان وا جارێکی تر لە نزیک دایکم و بەکری برام ئەخەوم. هەستم بە ئاسودەیی کرد و تێر لە ئەستێرەکانم ڕوانی. بەیانی کاتژمێر ١٠ بەهەمان جێب ئەوان گەڕانەوە و جارێکی تر جیابوینەوە. ئیتر تا ڕاپەڕین لێیان بێ ئاگامامەوە. پاش کەمێک من و هاوڕێکەم بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین و گەڕاینەوە بۆ شوێنی پشووەکەمان لەسەر حەوز و ئاوەکە.

لەم ماوەیەدا لە کۆبوونەوە و هەڵپەڕینی شەوانمان لای حەوز و ئاوەکە هەستم بە شتێکی تازە ئەکرد. هەڵپەڕینەکە گەرمتر و ڕیزەکان درێژتر و زیاتربوون. سەرنجی هاوڕێ سۆرانم دا جیاواز بوو لە شەوان سەرم لێی دەرنەئەکرد بۆ ئاوا بە گەرمی هەڵئەپەڕی. هەتا هاتە نزیکم و پیاڵەیەکی بۆڕاگرتم ئاوێکی سپی تیابوو. بەسەرسوڕمانەوە گوتم ئەوە چییە. هاوڕێ سۆران گوتی خێرا هەڵیدە ئارەقە حەیاتەکەیە. گوتم لە کوێت بوو دیسان گوتی تۆ هەڵیدە هەقت نەبێ هەر خێرا لێم وەرگرت و هەڵم قوڕاند. پاش کەمێک چوومە ڕیزی هەڵپەڕینەکەوە و لێی گەرم بووم. ئەوەندەی پێنەچوو هاتەوە نزیکم و گوتی ئەم پیاڵەیەشت بەرئەکەوێ بەیەکسانی بەشم کردووە. لێم وەرگرت فریانەکەوتم بیخۆمەوە لێم کەوت. نیوەی ڕژا زۆرم پێناخۆش بوو ئاخر شتیوا ڕێکەوت بوو. ئەو شەوە تا درەنگانێکی شەو زرمەمان هات لە هەموو شەوێک زیاتر هەڵپەڕین. بۆ بەیانی گەڕاینەوە سەر شاخ و سەنگەرەکانمان وەرگرتەوە. ئەمجارە جموجۆڵەکانی دووژمن زیاتر بوون. هەوڵەکانیان بۆ کۆنترۆڵکردنی




شاخەکان چڕتببۆوە. شەوێک لە قوڵی لای ئێمە تەواو نزیک ببوونەوە. هەموومان ئامادە و دەست لەسەر پەلەپیتکەبوین بە چرپە قسەمان دەکرد. لە ئان و ساتی دەستپێکردنی شەڕ بوین. فەرماندەی دەستە کاک هەژار گۆملەیی هاتەلام و گوتی. (بی کەی سی)یەکەم بدەرێ و تۆ بە تفەنگەکەی من شەڕ بکە. ئەو وایدانابوو شەڕەکە قورسە و خۆی شارەزایی زیاتری لێی هەیە. واشبوو ئەو لە منم کۆنتر و بە ئەزموونتر بوو. بەلام من عەدەد (بی کەی سی) کەرتەکەم تەواو خۆم ئامادە و سەغڵەت کردبوو. قسەیەکی ناخۆش بوو تەواو نیگەران بووم. بەلام فەرمانەکەیم جێبەجێ کرد. چوومە لای هاوڕێ سۆران گوتم. ئەوە

چییە هاوڕێ سۆران بۆ من چیمە کاک هەژار ئاوا ئەکات؟. ئەو سەرێکی بادا و پێی ناخۆش بوو. بەلام قەناعەتی پێکردم ئەمجارە قسە نەکەم. لەو شەوەوە لێک حاڵی نەبویین و ململانێ لە بەینی من و کاک هەژاردا دروستبوو. زۆر نەئەچوومە ژێر باری قسەکانی. (بی کەی سی) یەکەم نەئەدایە. بەلام هەر هاوڕێ بوین و قسەی ناخۆش و بێ ڕێزی دروستنەبوو لە بەینماندا. لە ناخی خۆمدا منیش خۆم بە کەمتر نەئەزانی لە ئەو. ئەمویست بیم بە فەرماندەی دەستە و ڕۆڵی خۆم لە کەرتەکەدا ببینم. بەلام لەم کاتەدا ئەم کەرتە تەنیا جێگەی یەک فەرماندە دەستەی تیابوو.

هاوڕێ سۆرانیش سەرپەرشتیاری کەرتەکە

بوو. بەڵام هەستم ئەکرد هاوڕێ سۆران هەم پشتیوانم بوو هەم لە کاتە سەختەکاندا پشتی پێئەبەستم.
هەتا لەسەر شاخ و سەنگەرەکاندا بووین هەموو بیرکردنەوە و قسەکردنمان تەنیا هاتن و دەرکەوتنی دووژمن و تەقەکردن و قایمکردنی سەنگەرەکان و چۆنیەتی شەڕکردن بوو. کاتێکیش بۆ پشووودان ئەچووینەوە لای حەوز و ئاوەکە ئەمانەمان هەمووی لەبیرئەکرد. تەنیا بەزمی شیلان و شەریفی قورئانی و هەڵپەڕین بەچواردەورەی ئاگرەکەدا و نوکتە و پێکەنین بوو. ئیتر ئاگامان لە هیچ گۆڕانکاریی و پێشهاتێکی سیاسی و سەربازی نەبوو. وامان دانابوو ئەوە ئیشی ئێمە نییە. ئیشی سەرکردایەتی و جەنابی مام جەلالە بیر لەو شتانە بکەنەوە و ئێمە تەنیا بڕیارەکانی ئەوان جێبەجێ دەکەین. لەم کاتەدا دەنگۆی گفتووگۆ و مفاوەزات بڵاوبووەوە. گوایە ڕژێم ئەیەوێت شەڕ رابگرێ و بە گفتووگۆ کێشەکان چارسەربکات. لە هەمان کاتدا بە نهێنی هێزی زیاتری لە بازنەی گەمارۆکەدا کۆئەکردەوە و جێگیری ئەکرد. شەڕیش هەر بەردەوام بوو. ڕژێم ئەیویست بە دەنگۆی گفتووگۆ هێزەکانی پێشمەرگە بخاتە چاوەڕوانی و ساردییان بکاتەوە. پاشان لەهەرچوارلاوە هێرشی فراوان بکات و زەبری گەورە لە هێزی پێشمەرگە بدات. سەرکردایەتی شۆڕش کە لەو کاتەدا زۆربەیان لەوێ بوون. لەناوبییان ببات. یان دەستگیریان بکات. بەڵام ئەم نیازەی دووژمن هەر زوو ئاشکرا بوو. سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری پاشەکشەی سەرتاسەری لە ناوچەکەدا. بە کتوپڕی لە ماوەیەکی کەمدا پێش جێبەجێکردنی پیلانەکەی دووژمن هەموو هێزی پێشمەرگە پاشەکشەی کرد. ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ بوو ئێمە بێئاگا لە هەموو ڕووداوەکان وەکو ڕۆژانی تر بەئامادەیی و لەناو سەنگەرەکاندا بە قەرەوڵی (بی کەی سی) و قەناسەکان بەدوای سەرباز و پلەدارەکانی دووژمندا ئەگەڕاین بیانپێکین. هاتن بەدوامانندا و وتیان هەموو کەلوپەلەکانتان کۆبکەنەوە و وەرنەخوارەوە. پێمان سەیر بوو خۆ هێشتا چەند ڕۆژێکمان ماوە بۆ کاتی خۆمان. ئیتر فەرمانە و ئەبێ جێبەجێی بکەین. هاتینەخوارەوە و لە نزیک ڕێگای حەوز و ئاوەکە بەدەستە ڕاستدا بەرپرسێکمان ڕاوەستابوو و گوتی. لامەدەن بەرەو گوڵان بڕۆن کەس نەوەستێت. ئینجا زانیمان پاشەکشەیە. یەکڕاست ڕۆیشتین بەرەو گوڵان. لەوێ بۆ نانی

ئێواره لـه ماڵـەکان دامەزرایـن. مـن لەگـەڵ چەنـد هاوڕێیەکـم چویـن بـۆ ماڵـی کاک خـدر. لـەوێ دایکـی پێشـمەرگەیەک ئـەو ڕۆژە هاتبـوو سـەموونی زۆری هێنابـوو. هـەر بەخێرایـی نانمـان خـوارد و خۆمـان ئامادەکرد بـۆ ڕۆیشـتین. مـن (بـی کـەی سـی)یەکەم و تاقمەکـەی و هەندێک کەلوپەلی تـرم پێبوو. بارەکـەم زۆر قـورس بـوو. بـەڵام گەنجێتیـم بەلایـەوە گرنـگ نەبـوو. کاتێـک ویسـتم هەسـتەمە سـەرپێ بەگـران هەسـتام. کاک خـدر بەخەمخۆرییـەوە هەسـتایە سـەرپێ و گوتـی. بـەم بـاره گرانـەوە چـۆن دەتوانـی ئەم ڕێـگا دووره ببـڕی. گوتـم خەمـت نەبـێ لـە ڕێـگا هاوکاریـم ئەکـەن. ڕێنمایـی زۆری کـرد و یـەک عەلاگـەی سـەمونی بۆپێچامـەوە و گوتـی ئەمـە بـۆ ڕێـگات زۆر پێویسـتە. گوتم نامـەوێ گوتـی. نابـێ ئەهـا کـە ئۆتۆمبێـل بەنزینـی تیانامێنـێ ئەوەسـتێ مرۆڤیـش ئاوایـە کـە وزەی نەمـا ئەوەسـتێ. گوتـم دەباشـە بـە شـوێنێکدا هەڵیواسـە. ئیتـر بـەلای چەپـدا لـە قایشـێکی قایـم کـرد. هـەرواش بـوو لـە ڕێـگا دوای ڕۆیشـتنێکی زۆر و ماندووبونێکـی زۆر فریـای مـن و زۆرێـک لـە هاوڕێیـان کـەوت. هەریەکـە لەتێکمـان لێخـوارد.

دوامالئاواییـم لە لـە کاک خدر و خێزانەکەی کـرد. سـەرنجی دایکـی پێشـمەرگەکەم دا. ئـەو بـە خەمێکـەوە سـەرنجی لەسـەرمان بـوو ماڵئاوایـم لەویـش کـرد. هاتینـەدەرەوە و ڕۆیشـتین. کاک خـدر وەک مامێکـی دڵسـۆز زۆر خەمـی ئێمـەی بـوو. هەتـا ڕەت بویـن هـەر ئەیگـوت خواتـان لەگـەڵ بێـت ئاگاتـان لەخۆتـان بێـت.

ئیتـر بەڕێکەوتیـن و گـوڵان و سـەر حـەوز و ئاوەکـە و بەزمی شـەوان و گـەرووی مەنجەڵ و کاروخ و هەمـوو یادگارییەکانـی ئەو ناوەمان بەجێهێشـت. لەسـەر جـادە سـەرەکییەکە ماڵئاواییمـان لـە چەکدارەکانـی فەوجـەکان کـرد کـە لەم سەریشـەوە ئەم سەراوسـەری جادەکەیـان گرتبـوو. تادیسـان بەسـەلامەتی لێـی دەربچیـن.




# لەبارەی میدیای کوردییەوە
# پەیامی نەتەوەیی و میدیای کوردی

پرسیارێکی جەوهەری کە ڕەنگە هەموو ڕۆژنامەنووسێک ئەو پرسیارەی لە خۆی کردبێت ئەوەیە: دوورکەوتنەوەی وەرگری کورد لە میدیای کوردی، پەیوەستە بە ئەو هۆیەوە کە میدیای کوردی لاوازە و ویستی وەرگر پڕ ناکاتەوە، یان لەم سەردەمی پێشکەوتن و زۆربوونەی هۆیەکانی ڕاگەیاندن و سۆشیال میدیادا، ناتوانێت ململانێ و کێبڕکێی زوو گەیشتنی زانیارییەکان بکات؟

دوور و نزیک ئەو بڕوایە بە هۆکاری سەرەکی نازانم کە باس لە زۆربوونی هۆیەکانی گەیاندن و کاریگەری سۆشیال میدیا دەکات لەسەر میدیای کوردی، ئەگەر ئەم بیرکردنەوە و بڕوایە بۆ میدیای کوردی ڕاست بێت ئەوا چەندانجار بۆ میدیای ئەوروپی و ئەمریکی و جیهانیش ڕاست دەبوو. لە کاتێکدا میدیای ئەوروپی زووتر

کەوتنــە پێشــبڕکێ و ناکۆکییــەوە لەگــەڵ سۆشــیال میدیــا و زووتــر لــەلای ئــەوان دەرکــەوت. بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا هێشــتا میدیــای ئەمریکــی و ئەوروپــی خــاوەن بینــەر و وەرگــری خۆیانــن و میدیــای ئــەوان دەتوانێــت گــۆڕان لــە ئاراســتەی بیرکردنــەوە و وشــیاری تاکــدا دروســت بــکات. تەنانــەت میدیــای ئەمریکــی زۆرجــار بەنــاوی جیهانیشــەوە قســە دەکات. لــە ڕاســتیدا تۆرانــی وەرگــر و تاکــی کــورد لــە میدیــای کــوردی، بــە پلــەی یەکــەم دەگەڕێتــەوە بۆ ئــەو هــۆکارەی کــە میدیــای کــوردی ناتوانێــت لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە پێویســتییە نەتەوەیــی و نیشــتمانیی و زمانەوانــی و زانســتی و ڕۆحــی و .... هتــد بــۆ تاکــی کــورد. بــۆ بینــەر و وەرگــری کــورد پــڕ بکاتــەوە و ئــەوەی ئــەوان دەیانەوێــت ئــەم میدیایانــە پێیاننابەخشــن. بەمانایەکــی دیکــە، وەرگــری کــورد بــە دوای شــتێکدا دەگەڕێــت و پێویســتی بــە شــتێکە. بــەڵام میدیــای کــوردی لــە شــوێنێکی دیکەیــە و شــتێکی دیکــە بــۆ بینــەر و وەرگــری کــورد دەنێرێــت کــە پێویســت نییــە و وەرگــری کــورد

وێنەی میدیای کوردی لە بیر و هزری وەرگری کورددا ئەوەندەی وێنەیەکی تەواو لێوان لێوکراوە بە پرسی حزب و وتار و بەرگریی لە حزب، ئەوەندە وێنەیەکی نەتەوەیی تێدا نابینرێت کە وەرگری کورد شانازی پێوە بکات و پێویستی بە میدیای پیانی نەبێت.




نایەوێت یان ڕقیشی لێی دەبێتەوە. ئەو وێنە سیاسییە پڕ کێشە و پێکدادانەی لەنێوان هێزە سیاسییەکاندا خرایەسەر شاشەی ڕاگەیاندنە بینراوەکانی باشووری کوردستان، ئەوەندە وەرگری کوردی بێزار و تووڕە کرد. ئیدی میدیای کوردی کرد بە جێگەیەک بۆ پرسە حزبییەکان و بەرکەوتنی کادیر و لایەنگری حزبەکان نەک جێگەیەک بۆ پرسە نەتەوەییەکان و داڕشتنی ستراتیژ و پەیامی نەتەوەیی کورد. واتە: وێنەی میدیای کوردی لە بیر و هزری وەرگری کورددا ئەوەندەی وێنەیەکی تەواو لێوان لێوکراوە بە پرسی حزب و وتار و بەرگریی لە حزب، ئەوەندە وێنەیەکی نەتەوەیی تێدا نابینرێت کە وەرگری کورد شانازی پێوە بکات و پێویستی بە میدیای بیانی نەبێت.

لەنێوان هەردوو وشەی «تێربوون» و «تۆران»ی وەرگری کورددا لە میدیا، ئێستا وەرگری کورد «تۆراو»ە لە میدیا. وەرگری کورد نەک پێویستییەکانی تێر نەبووە لە ڕێگەی میدیاوە، بەڵکو وەرگری کورد هەڵدێت لە دەست میدیای کوردی، هەڵدێت لە دەست لاوازی زمانی کوردی میدیاکان و بەرنامە و چۆنیەتی خەمی نەتەوەیی کورد لەم مۆدێلە کارکردنەدا کە ئێستا میدیای کوردی هەیەتی. میدیای کوردی شتێکی نەماوە بە ناوی بەرپرسیارێتی زانستی و ڕۆشنبیری

بۆ وەرگر، ئەم میدیایانە ئامادەن ناکۆکی و پێکهەڵپژانی دوو شاری کوردستان بگوێزنەوە، قسەی کەسێکی ئاسایی بکەن بە جێگەی بایەخ و ئیشی لەسەربکەن و ئامادەن ئیش لەسەر هەموو جۆرەکانی پێکدادانی ناوخۆیی بکەن و بەلاشیانەوە ئاساییە و بە کەموکورتی نەتەوەیی نابینن، بەڵام هەرگیز ئامادەنین ئیش لەسەر ئەوە بکەن چۆن شەڕی ڕۆشنبیرکردن و کرانەوە و تێپەڕاندنی ئەم مۆدێلەی کارکردنی میدیا بکەن و بازدانێک بەسەر مێژووی خۆیاندا بکەن.

لە ڕاستییەک گومانم نیە کە وەرگری کورد، وەک هەر وەرگرێکی دیکەی جیهانی خەونی ئەوەی هەیە کە کوردیش میدیای نیشتمانیی و نەتەوەیی تایبەت بەخۆی هەبوایە و شەڕی هەموو دەستکەوت و مافەکانی خۆیی پێ بکردایە، بەڵام کاتێک ئەو خەونەی بۆ نایەتەدی لەناو میدیای کوردیدا و لە بری میدیایەکی نەتەوەیی و نیشتمانیی، میدیایەکی دوور لە هەر ئەجێندا و سیاسەتێکی کوردیانە دەبینێت، ئەوا جگە لە تۆران و هەڵهاتن لە دەست ئەو میدیایە، هیچی دیکەی لە دەست نایەت. لە بارێکی دیکەدا هەڵهاتنی وەرگری کورد لە میدیای کوردی بە مانای ئەوە نییە ئەم وەرگرە تەواوی بوونێک بەناوی نەتەوەی کورد ڕەت دەکاتەوە، بە پێچەوانەوە کاتێک وەرگر خەونێتی، یان داوای میدیایەک دەکات بچێتە خزمەت دۆزی ڕەوای کوردەوە، مانای وایە تاکی کورد هێشتا دڵسۆز و خەمخۆری پرسە نەتەوەیی و نیشتمانییەکەیەتی و شەڕی شکۆ و ناسنامەی کوردیانەی خۆی دەکات. ئەوەی لێرەدا ناومان لێ ناوە هەڵهاتن لە میدیای کوردی، شتێکی سەربێیی و کاتی نییە، بەڵکو تۆرانێکی گەورەی وەرگری کوردە کە پەیوەستە بە پرۆسەیەکی هەستیار و پیرۆزی وەک نەتەوە و نیشتمان لەلایەک و پەیوەستە بە چەندان بابەتی دیکەی وەک ئیتیک و لاوازی کارکردن و بە حزبیبوون و بە کەسیبوونی میدیای کوردی لەلایەکی دیکەوە. ئەم میدیا کوردیانە چەند

بابەتێکی پێکەنیناوی و چەند درامایەکی ناکوردی وەرگێڕدراو و چەند هەواڵێکی سیاسی و وەرزشی ناوخۆییان لێوەرگرەوە، ئیدی شتێکیان نییە بۆ وتن و کار لەسەرکردن، بۆیە تاکو ئەم شێوازی کارکردنە بەردەوام بێت ئەوا زیاتر وەرگری کورد پشت دەکاتە میدیای کوردی. تۆرانی وەرگر لەگەڵ میدیای کوردی بەو ئاستە گەشتووە هەرکاتێک لە میدیایەکی ناکوردییەوە شتێک لەسەر کورد دەوترێت، وەرگری کورد بە گرنگ و پڕ بایەخ دەیبینێت و بەلایەوە سەیر و نامۆیە.

هەڵهاتنی وەرگری کورد لە میدیای کوردی، لە سادەترین مانایدا واتە وەرگری کورد ئەو شێوازە کارکردنەی ناوێت کە میدیای کوردی ئەمڕۆ کاری پێدەکات، بە هیچ پێوەرێکی میدیایی و زانستی و تەنانەت نەتەوەییش ئەم میدیا کوردییانە کار و وەشانی خۆیان نەخستۆتە خزمەتی کوردەوە. وەرگری کورد ئێستا ئەوەندە وشیار و بە ئاگایە کە کاتێک بەراوردی میدیای کوردی بە میدیای هەر نەتەوەیەکی دیکە دەکات، بۆی دەردەکەوێت کە میدیای کوردی چەندە لە پاشە و چەندە بێدەربەست و بێهەڵوێستە لە هەر هێرش و زیانێک کە بەر کورد و پیرۆزییەکانی دەکەوێت. ئەو وەرگرەی میدیای کوردی ڕەت دەکاتەوە هەڵنەهاتووە لە خودی نەتەوە و نیشتمان و هەموو ئەو بەهایانەی کە موڵکی نەتەوەکەیەتی، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕەخنەی وەرگری کورد لە شێوازی کارکردنی میدیای کوردی واتە بوونی ویستێکی گەورە بۆ نزیکی لە نەتەوە و جۆشدانەوەی ڕۆحی نەتەوە و پیرۆزکردنی بەهاکانی نەتەوە لە ڕێگەی میدیاوە و پیشاندانی بە دەرەوەی ئەم بوونە کوردییە. ئەم وەرگرە نایەوێت پرسی کورد تەنها بە گوێی کورددا بدرێت و لە جوگرافیایەکی بچوکی وەک کوردستاندا بوونی هەبێت، بەڵکو پێویستە ببرێتە دەرەوە و ڕووبەری کارکردنی میدیا گەورەتر و فراوانتر بکرێت.

تورەیی وەرگری کورد ئەوە




دەرئەنجامەکەیەتی کە. بە هەموو جۆرێک ئەم میدیا کوردییەی بایکۆت کردووە. بەلای ئەم وەرگرەوە بە هەفتە و مانگ لە میدیای کوردی نەڕوانێت و تیڤییەکەی نەکات بەسەر هیچ کەناڵێکی کوردی. شتێکی گەورە لە دنیای ئەودا ناگۆڕێت و بە زیان بۆسەر هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی و خەرمانی زانیاری و ڕۆشنبیری ئەو ناشکێتەوە. بەمانایەکی دیکە ئێستا میدیای کوردی چەندە بێباکە لە وەرگری کورد و تاکی کورد. بە هەمان شێوە وەرگری کوردیش بە هەمان بڕی دووری نێوانیان و بگرە زیاتریش. تورەیە لە میدیای کوردی. مایەی نیگەرانی و هەڵوێستی جدییە ئەم میدیا کوردییانە کارێکی ئەوتۆیان لەگەڵ بینەر و بیسەر و خوێنەری کورد کردووە. لە ماوەی سی ساڵی ڕابردوودا ئەوەندەی دوورکەوتوونەتەوە لە یەکدی. هێندە هەردوولایان نزیک و کۆک نەبوون لەسەر پرسە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی کورد



وودی ئالن

مادام ئازاری کەس نادەم ئیدی لام گرنگ نییە خۆشتان دەوێم
یان نا من نەهاتوومەتە سەر ئەم زەوییە بۆ ڕازیکردنی هەمووتان



سوقرات

کە لە ژیان گەیشتیتە لوتکە، ئینجا دەوروبەرەکەت ئەزانن کێ بووی
بەڵام کاتێك کە ئەکەوی، ئەو کات تۆ ئەزانی دەوروبەرەکەت
چ کەسانێك بوون



ئەلبێرت کامۆ

بۆ کەسێك کە لە ژیاندا، تامی بەدبەختی زۆر کردووە
مردن بۆ ئەو ڕووداوێکی، کتوپڕ نییە لە ژیاندا..

وتەی بەنرخ

ئەو دەستەی لەکاتی کەوتندا بەرزت ئەکاتەوە
زۆر لەو دەستانە باشترە کە دوای هەستانەوە تەوقەت لەگەڵ ئەکەن




لە دەستی «دۆستی» دوو ڕوو

عەجەب دڵم تەنگە.

فیدای ئەو «دوژمنە»بم

کە یەک ڕەنگە



# پیرەمێرد

نارازی نەبیت قەت بەم ژیانە
خۆشی و ناخۆشی بەشی یەزدانە
ئاخ هەڵمەکێشە بۆ خۆت بەرزتر
بڕوانە خەڵکی بێ خانە و لانە



پۆلێك لە پێشمەرگەكانی
یەكێتی نیستیمانی كوردستان
لەسەر گۆڕی پێشمەرگەیەكی هاوڕێیان

ڕێبەر